# ڕۆشنبیریی سیاسی

سەروەر حەمە ئەحمەد

هەولێر
٢٠١٣

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

- ڕۆشنبیریی سیاسی
- نووسینی: سەروەر حەمە ئەحمەد
- نەخشەسازی ناوەوە: سەنگەر دلاوەر عەبدوللا
- بەرگ: ڕێمان
- ژمارەی سپاردن: ( ٢١٧) لەساڵی ٢٠١٣
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٣
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٧٧٩)

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

زانستی سیاسەت وەك هەر زانستێکی دیکە لە مێژە بایەخی داوە بە لایەنە کولتورییەکانی سیاسەت، دیاردەی ڕۆشنبیریش یەکێکە لە دیاردە هەرە گرینگەکانی نێو ئەم زانستە کە بۆتە جێگەی گرینگی پێدانی زانایانی ئەم زانستە، بەو پێیەی کە ڕۆشنبیریی سیاسی بەشێکە لە ڕۆشنبیریی گشتیی کۆمەڵگە کە مەبەست لێی کۆمەڵێك زانیاریی و تێڕوانین و ئاراستە و بەهای باوە سەبارەت بە کاروباری سیاسی و حوکمڕانی، دەوڵەت و دەسەڵات، وابەستەبوون و ڕەوایەتی، بەشداریکردن، کە پێوەندییان بە سیاسەتەوە هەیە لە هەموو کۆمەڵگەکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا سرووشتی پێوەندیی نێوان هاووڵاتی و حکوومەت ڕون دەکاتەوە. بۆیە هەر لە سەدە کۆنەکانەوە فەیلەسووفان و هزرڤانان تێڕوانینی خۆیان لەسەر ئەم بابەتە دەربڕیوە، بۆ نموونە لەسەدەی شەشەمی پێش زایینی دا "کۆنفۆشیۆسی" فەیلەسووفی چینی لە سێ نووسراوەکەی خۆیدا (باوەڕی میانڕۆی و گەورەترین فێرکردن و گۆڕانکارییەکان) جەخت دەکاتەوە لەسەر چاندنی تۆوی ڕاستی و دادپەروەری و خۆشەویستی و ڕۆشنبیریی لە دەروونی مرۆڤەکاندا، ئەمەش لە ڕێگەی فێرکردنێکی جدییەوە بۆ ئەوەی سیستەمێکی سیاسی تەندروست بێتە ئاراوە کە فەرمانڕەواییەکی چاك بکات، دواتر پاش دوو سەدە فەیلەسووفی یۆنانی "ئەرستۆ" لە دەروازەی یەکەمی کتێبی سیاسەتدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە هەموو کۆمەڵگەیەکی سیاسی خاوەنی هەندێك کولتوور و ئاکاری دیارکراوە کە زامنی سەقامگیری و بەردەوامبونی دەکەن. پاشان ئەگەر باسێك لەسەردەمە نوێیەکان بکەین دەبینین کەوا فەیلەسوفەکان باسی ڕەهەندەکانی ڕۆشنبیریی سیاسییان کردووە، "جان جاك ڕۆسۆ" فەیلەسووفی فەرەنسی کە لە سەدەی هەژدە ژیاوە ئاماژە دەکات بە گرینگی هەست و سۆزی گشتیی و گونجاو بۆ دیموکراتی سیاسی.

هەروەها "ئەلیکس دی تۆکیڤیلی" فەرەنسی لە کتێبی (دیموکراتی لە ئەمەریکا) جەخت دەکاتەوە لە ڕۆڵی بەها کولتووریەکان لە پرۆسەی سیاسی لە ناو کۆمەڵگەی ئەمەریکی دا. بۆیە دەبینین فەیلەسووفان و هزرڤانان پێوەندییەکیان دروستکردووە لە نێوان ڕۆشنبیریی سیاسی و سیستەمی سیاسی فەرمانڕەوا و بەدیهێنانی کۆمەڵگەیەکی دیموکرات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی گشتیی ئەم لێکۆڵینەوە فەلسەفییانە مەیلی تێڕامان و وردبوونەوە بەسەریاندا زاڵ بووە، ئیتر وەك کاردانەوەیەك بۆ ئەم مەیلە لەلایەك و کاردانەوە بۆ کاریگەریی ڕەفتاری لە لێکۆڵینەوە سیاسییەکاندا لەلایەکی دیکەوە تیمێك لە زانایانی سیاسەت بایەخیان داوە بە لێکۆڵینەوەی کولتووری سیاسی لە ڕووی تیۆری و مەیدانییەوە. لەو دەمەشەوە بۆ یەکەمجار زاراوەی ڕۆشنبیریی سیاسی لە وتارە نێودارەکەی "گابریل ئەلمۆند"دا لەژێر ناونیشانی (سیستەمە سیاسییە بەراوردکارەکان) بەکارهاتووە کە لە ساڵی ١٩٥٦ دا بڵاوکراوەتەوە. پاشان بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش تەشەنەی کردووە و باسی لێوەکراوە.

بۆیە دەکرێ وێنای ڕۆشنبیری سیاسی بکەین وەك ژینگەیەك یان کەشێکی سایکۆلۆژی و بەهایی کە سیستەمی سیاسی لەناویدا کار دەکات و هەموو ڕێچکە سیاسییە جیاوازەکان دەگرێتە خۆی، کە بەها و بیروباوەڕ و دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان لەم ژینگەیەدا کار لەسیستەمی سیاسی دەکەن و لەژێر کاریگەریی ئەو سیستەمەدا جووڵەی ئاسایی خۆیان دەکەن.

## خستنەڕووی بابەتی تۆژینەوەکە:

ئاشکرایە لە گشت تۆژینەوەیەکدا پێویستە دیاردەیەك یاخۆ کێشە و بابەتێك بوونی هەبێت و سەرنجی لێتۆژ ڕابکێشێت بۆ لێکۆڵینەوەی، بۆیە یەکێك لەو کارانەی کە لێتۆژ پێی هەڵدەستێت بریتییە لە دیارکردنی بابەتی تۆژینەوەکەی و جیاکردنەوەی لەو بابەتانەی کە پێوەستن پێوەی. ڕۆشنبیریی سیاسی یەکێکە لەو بابەتانەی کە لە ڕۆژگاری ئەمرۆماندا جێی گرینگی و بایەخی تایبەتین و پانتاییەکی بەرچاوی لە زانستی سیاسەتدا دیارکردووە. بۆیە لەبەر کەمی تۆژینەوە لەسەر ئەم بابەتە لەلایەك و گرینگی و زیندوی خودی بابەتەکە لەلایەکی دیکەوە ئەوەندەی لە تواناماندا بوو بێت هەوڵمان داوە لە چوارچێوەی ئەم تۆژینەوەیەدا تیشکێك بخەینە سەر (ڕۆشنبیریی سیاسی و کاریگەریی لە بە دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگە (هەرێمی کوردستان وەك نموونە).

## گرینگی تۆژینەوەکە:

هەر کۆمەڵگەیەك بۆ ئەوەی سیستەمێکی دیموکراتی تێدا بەرجەستە ببێ لەپاڵ بوونی بنەما و پێداویستیەکانی دیموکراتی، پێویستیی بە بوونی ڕۆشنبیرییەکی بەرزی سیاسی هەیە بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵگەیە ئامادەگی ئەوەی تێدابێ کە بنەما دیموکراتییەکان تێیدا بەرجەستە ببێ، لەم تۆژینەوەیەدا (هەرێمی کوردستان)مان بە نموونە وەرگرتووە، پاشان کەمی لێکۆڵینەوە لەبارەی کۆمەڵگەی ئێمە و لەسەر بابەتێکی هەستیاری وەك ڕۆشنبیریی سیاسی بە شێوەیەکی زانستی و پشت بەستوو بە میتۆدی زانستی، گرینگی ئەم جۆرە تویژینەوانە ڕوون دەکاتەوە.

ڕۆشنبیریی سیاسی لەبەر بلاوترین ئەو چەمکانەیە کە لە لایەن زانایان و شرۆڤەکارانی سیاسی و یاسایی و کۆمەڵایەتییەوە بایەخی بەر چاوی پێ دەدرێت. لەم تۆژینەوەیەدا دەمانەوێت سرووشت و شێواز و ڕەهەندەکانی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەدا شرۆڤە بکەین و کاریگەرییەکانی لە بەدیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگە بخەینەڕوو.

## ئامانجی تۆژینەوەکە:

لە پشت هەموو تۆژینەوەیەکەوە کۆمەڵێك ئامانج هەیە کە لێتوژ لە ڕێگەی تۆژینەوەکەیەوە دەیەوێت پێیان بگات. ئامانجامان لەم تۆژینەوەیە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە لە ڕێگەی ئەم تۆژینەوەیەوە بگەین بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەی لای خوارەوە:

١. ئایا ڕۆشنبیریی سیاسی تا چەندە دەتوانێ ڕۆڵ ببینێ لە بەدیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگە؟.
٢. پێوەندی و کاریگەریی نێوان ڕۆشنبیریی سیاسی و شێوازی سیستەمی سیاسی چۆنە و بە چ شێوەیەکە؟.
٣. ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو و دیموکراتیدا بە چ ڕێگە و کەناڵێك بەدی دەهێنرێت؟.
٤. ڕەوشی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردی و هەرێمی کوردستان لە چ ئاستێك دایە؟ و تاکی کورد تا چەند ڕۆشنبیرە بە پرسە سیاسییەکان؟.

## گریمانەی تۆژینەوەکە:

ڕۆشنبیریی سیاسی بابەتێکە لێتوژ لە زۆر ڕوانگەوە دەتوانێت تۆژینەوەی لەسەر بکات و پێوەندیی بە زۆر پرسی جۆربەجۆرەوە هەیە، بێگومان هەموو تۆژینەوەیەك پێویستیی بە گریمانە هەیە تاکو چوارچێوەیەك بۆ تۆژینەوەکەت دابنێیت و بگەیتە بەرئەنجامی گریمانەکەت، لە میانەی تۆژینەوەکەماندا ئەم گریمانە سەرەکییەمان خستۆتەڕوو، "ڕۆشنبیریی سیاسی ڕۆڵێکی بەرچاو و کارای هەیە لە بەدیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگە".
لەگەڵ ئەم گریمانە لاوەکییە (ڕۆشنبیریی سیاسی لای تاکی کورد لە ئاستی پێویست دا نییە).

## میتۆدی تۆژینەوەکە:

لەم تۆژینەوەیەدا پشتمان بە میتۆدی (وەسفی ـ شیکاری سیاسی) بەستووە کە بریتییە لە تاوتوێکردنی بیرۆکەکە لەژێر ڕۆشنای بیرورا جیاوازەکان بەو پێیەی کە لەسەرەتادا وەسفی بابەتەکە دەکرێت و پاشان شیکردنەوەیان لەبارەوە دەکەین، دیارکردنی میتۆدی تۆژینەوەکە بەکارێکی هەستیار دادەنرێت و لێتوێژ دەبێت بە ئاگاییەوە ئەو میتۆدە هەڵبژێرێت کە لەگەڵ بابەتەکەی دا بگەنجێت، چونکە میتۆد بریتییە لە ڕێوشوێن و ڕێگەی جیاواز بۆ گەیشتن بە زانین و زانیاریی کە ڕێگە و پلانی دیارکراو دەگرێتە خۆی بۆ تاوتوێکردنی پرسیارەکان و تاقیکردنەوەی گریمانەی تۆژینەوەکە، لەو کاتەی کە شیکاری سیاسی ئەو میتۆدەیە کە لە ڕێگەیەوە زانیارییەکان لە چوارچێوەی زانستی سیاسەت شی دەکرێنەوە و هەڵوەستەیان لەسەر دەکرێت، هەروەها ئەم تۆژینەوەیە لە دەروازەی دووەمی دا کە تایبەتە بەلایەنی مەیدانی بۆ لێکۆڵینەوەی زانیارییەکانی نێو فۆڕمی ڕاپرسییەکە کە بەشێکە لە تۆژینەوەکە پشتمان بە میتۆد و داتا ئامارییەکان بەستووە تاوەکو بە شێوەیەکی زانستی و ئەکادیمی زانیارییە هاتووەکان شی بکەینەوە و شرۆڤەیان بکەین.

## گرفت و ئاستەنگەکانی تۆژینەوەکە:

بێگومان هیچ تۆژینەوەیەك بەبێ گرفت و ئاستەنگ بەڕێوەناچێ و ئەنجام نادرێت، بەڵام ئاستەنگ لە هەموو تۆژینەوەکاندا وەك یەك نابێت و دەگۆڕێت بەپێی بابەتی تۆژینەوەکە، لەو گرفت و ئاستەنگانەی کە دووچارمان بووە بریتی بووە لە گرفتی گرانی بەدەست خستن و دۆزینەوەی سەرچاوەی کوردی لەسەر بابەتێکی وەك ڕۆشنبیریی سیاسی کە بەشێوەیەکی زانستی و ئەکادیمییانە نووسرابێت، ئەمە سەبارەت بەلایەنی تیۆری تۆژینەوەکە، هەرچی سەبارەت بە ئاستەنگەکانی لایەنی مەیدانییە ڕەنگە زۆرتر و گرانتر بوو بێت لەبەرئەوەی هەموو کەسێك ئامادە نییە، وەڵامی پرسیارەکانی فۆڕمی ڕاپرسیەکە بداتەوە، هەندێك لەوانەش کە وەڵامیان

داوەتەوە، بێ هەڵوێستەکردن و بیرکردنەوە لەبارەی پرسیارەکانەوە خانەکانی نێو فۆڕمەکەیان پڕکردۆتەوە، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەشێك بووە لە گرفتەکان سەرەڕای بوونی چەندین گرفتی دیکە.

## پەیکەری تۆژینەوەکە:

ئەم تۆژینەوەیە لە دوو دەروازەی سەرەکیی پێکهاتووە، دەروازەی یەکەم، کە دەکاتە لایەنی تیۆری ئەم تۆژینەوەیە، هەوڵمانداوە چەند زانیارییەك بخەینەڕوو، کە سێ بەشی لێکۆڵینەوەکە دەکەوێتە ئەم دەروازەیەوە. لەبەشی یەکەمدا باس لە ناساندنی چەمکی ڕۆشنبیری و ڕۆشنبیریی سیاسی دەکەین. لە لایەکەوە تیشکێك دەخەینە سەر چەمکی ڕۆشنبیری، لەلایەکی دیکەشەوە ڕۆشنبیریی سیاسی شرۆڤە دەکەین. بەشی دووەمی تۆژینەوەکە تەرخانکراوە بۆ قسەکردن لەسەر ڕۆشنبیریی سیاسی و دیموکراتی، کە تیایدا ئاماژە بە ڕۆشنبیری سیاسی و کاریگەری لەبەر دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگە دەکەین، لەگەڵ ئەوەشدا باسێك لە کاریگەری و پێوەندیی نێوان ڕۆشنبیریی سیاسی و شێوازی سیستەمی سیاسی دەکەین، هەر لەم بەشەدا تیشکێك دەخەینە سەر کەناڵەکانی بەدیهێنانی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەیەکی دیموکراتیدا. هەرچی بەشی سێیەمی تۆژینەوەکەمانە باس لە پرسی ڕۆشنبیری سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردیدا دەکەین کە تیایدا ئاماژەبە ناسیۆنالیزم و کولتووری کورد لەلایەك و سیستەمی سیاسی و پێوەندیی هاووڵاتی و دەسەڵات لەلایەکی دیکەوە دەکەین، لەگەڵ ئەوەشدا تیشکێك دەخەینە سەر ڕەوشی ڕۆشنبیریی سیاسی لە هەرێمی کوردستان. دەروازەی دووەمی تۆژینەوەکە بریتییە لە لایەنی مەیدانی، سێ بەش لە خۆدەگرێت لە بەشی یەکەمدا باس لە ئامادەکارییەکانی پرۆسە مەیدانییەکە کراوە، لە بەشی دووەمدا باس لە شیکردنەوەی ئەنجامی فۆڕمەکانی تۆژینەوەکە

كراوە، بەشی سێیەممان تەرخانكردووە بۆ بەرئەنجامی لێكۆڵینەوە مەیدانییەكە و پێشنیاز و ڕاسپاردەكان لەبارەیانەوە، تۆژینەوەكەش كۆتایی دێت بەو بەرئەنجام و ڕاستییانەی كە پێی گەیشتووین.

**لێتۆژ**

**سەروەر حەمە ئەحمەد**

**٢٠١٠/٦/١ هەولێر**

# دەروازەی یەکەم: لایەنی تیۆری

## بەشی یەکەم: ڕۆشنبیری و ڕۆشنبیریی سیاسی.

### (١-١) چەمکی ڕۆشنبیریی [١]

#### (١-١-١) پێناسەی ڕۆشنبیریی.

دیـاره هـەر کۆمەڵگەیـەك خـاوەن تایبەتمەنـدیی خۆیـەتی کـە ڕەنگدانـەوەی ئـەو ڕۆشنبیریە باوەیە کە لەنێو تاکەکانیدایە، ئەو ڕۆشنبیریەی کە هەیە کۆمەڵێك بەها و چەمك و ڕەوت و ئاراستە و زانیـاریی گەشـە پـێ دەدات. کـە لـە ڕێگـەی میراتـی مێژووی و شارستانی و کەتواری جـوگرافی و پێکهاتـەی کۆمەڵایـەتی و سرووشـتی سیستەمی سیاسی و ئابوورییەوە بەدەستهاتوون و بەدیهێنراون، سەرەڕای ئەوەی کـە هۆکـار و کارتێکـەرە دەرەکیـەکان ڕۆڵیـان هـەبووە و شـارەزای و وابەسـتەبوونە جیاوازەکانیان پێکهێناوە، کە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە جیاوازە و دەگۆڕێت.

بۆیە کاتێك کە ڕاڤەی چەمکی ڕۆشنبیریی دەکـەین دەبیـنین جیاوازییـەکی زۆر لـە نێـوان لێتـوێژان و هزرڤانانـدا هەیـە لـەبارەی ئـەم چـەمکە و پێناسـەکردنی، لـە

---

(١) چەمکی ڕۆشنبیری هاوواتای چەمکی (الپقافە)یە لە زمانی عەرەبی و چەمکی (Culture) لە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و چەمکی (kultur) لە زمانی ئەڵمانی دا.

هەمانكاتدا لێتـوێژان و هزرڤانـان نەگەیشـتوونەتە ڕێكـەوتنێك تـاكو پێناسـەیەكی دیاركراو و یەكگرتوو بەم زاراوەیە ببەخشن.

هەندێ لە لێتوێژان و هزرڤانان چەمكی ڕۆشنبیریی دەهەمبەر بەها و واتـای ژیـار (حضارة) دادەنێنن، هەندێكی دیكەیان ئـەم چـەمكە دەبەسـتنەوە بـە نـاوەڕۆك و كرۆكی پەروەردەی تاكەكانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا كۆمەڵێكی دیكەیان ئـەم چـەمكە بەكاردەهێنن بۆ جیاكردنەوەی مرۆڤەكان و چالاكی و كارەكانی لە ئـەوانی دی لـە كۆمەڵگە دا [٢].

لە پێناسە كلاسیكییەكاندا زاراوەی ڕۆشنبیریی بەم شێوەیە گوزارشتی لێكراوە كە "ڕۆشنبیریی ڕێگەی ژیـانی خەڵكـە way of life ". لـە لایـەكی دیكـەوە (ڕۆشـنبیریی واتـای زانیـاریی گشـتیی و پسـپۆڕی دەگەیـەنێ، كـە ئەمـەش ناوەڕۆكەكەی برێتییە لەو زانیارییانەی كە بەرهەمی هزر و داهێنان و شاكاری مرۆڤە، كە كۆبۆتەوە بە درێژای ڕەوتی شارستانێتی و زانیاریی مرۆڤـەكان لـە هەموو بوارێكدا، كە پێكهاتووە لە زانیاری سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئـاینی و زانستی و ئەدەبی و ئـابووری و فەلسـەفە و هونـەر و بـەڕێوەبردن) [٣]. واتـە ڕۆشنبیریی خۆی لە كۆمەڵێك مەعریفە و هەست و كار و چالاكی و لێهـاتووی دەبینێتەوە كە كەسێك لە كەسێكی دیكە جیادەكاتـەوە، بۆیـە دەكـرێ بڵـێین ڕۆشنبیریی شێوەیەكی سەرتاپاگیرییە لە هەمـوو بـوارە جۆربـەجۆرەكانی هـەر كۆمەڵگەیـەك لـە كۆمەڵگـەكان. لـە چوارچـێوەی پێناسـەكردنی زاراوەی

---

(٢) د.عبدالله احمد الذيفاني، التربية والمجتمع والثقافة، مجلة دراسات اجتماعية، مجلة فصلية علمية يصدرها قسم الدراسات الاجتماعية، بيت الحكمة ـ بغداد، سنة الثانية، رقم (٥)، ٢٠٠٠م، ص ١٢.

(٣) خالید خاڵ، كوردایەتی و ڕۆشنبیری، چاپی یەكەم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی ، ٢٠٠٧ز، ل ٤٠.

ڕۆشنبیرییدا ئاماژە بە چەمکی ڕۆشنبیریی دەکەین لە گۆشەنیگای هەندێ لە زانایان و فەیلەسووفان و هزرڤانانەوە، بۆنموونە:

تایلۆر Taylor ئەنترۆپۆلۆجیستی ئینگلیزی لە پێناسەی ڕۆشنبیرییدا دەڵێت: (ڕۆشنبیریی بریتییە لە تێکڕای ئەو ئاوێتەیەی کە مەعریفە و بیروباوەڕ و هونەر و ڕەوشت و یاسا و نەریت و توانا و ئاکارەکان بە خۆیەوە دەگرێ، کە مرۆڤ لە ئەنجامی بوونی وەك ئەندامێکی کۆمەڵگە وەریان دەگرێت). لەلایەکی دیکەوە کلکهورن Kluckhorin ڕۆشنبیریی بەم چەشنە پێناسە دەکات (ڕۆشنبیریی بریتییە لەو هۆکارە جیاجیایانەی ژیان کە مرۆڤ لە کۆنەوە لەگەڵ ڕەوتی مێژووەوە پێیان گەیشتوە. ئەو هۆکارانەش چ ئاشکرا و چ نادیارەکانیان، چ هۆشەکی و چ ناهۆشەکیەکانیان بێ، ئەوانەی لە کاتێکی دیارکراودا هەنە و چ ئەوانەی دەبنە چەند هۆکارێکی ڕابەرایەتی، ڕەفتاری تاکەکان لە کۆمەڵگەدا ئاراستە دەکەن) (٤)

شاعیری ئینگلیزی ئیلیوت T.S.Eliot لە پەڕتووکەکەیدا بەناوی (چەند تێبینییەك لەمەڕ پێناسەی ڕۆشنبیریی) دەڵێت: (ڕۆشنبیریی شێوازی ژیانی گەلێکی دیارکراوە کە لە چێوارێکدا دەژین). واتە ڕۆشنبیریی بەشێوەیەکی سادە و ساکار دەکرێ بڵێین (ئەو پاڵنەرەیە کەوا لە مرۆڤەکان دەکات مەیلی ئەوەیان هەبێت کە ژیان شایەنی ئەوەیە تێیدا بژیت) (٥).

کەواتە ئەوە ڕۆشنبیریە کەوا دەکات ئەم کۆمەڵگەیەی کە مرۆڤەکان تێیدا دەژین ببێتە کۆمەڵگەیەکی تەندروست، سەرباری ئەو جیاوازییەی کە هەیە لە پێناسەکردنی زاراوەی ڕۆشنبیرییدا، بەڵام لێرەدا ئاماژە بەو پێناسەیە دەدەین کە تا ڕادەیەك

---

(٤) نقلا عن: موريس دوفرجية، علم اجتماع السياسة، ت:د.سليم حداد، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت، ٢٠٠١م، ص٧٧-٧٨.

(٥) وەرگیراوە لە: د.شێرزاد نەجار، هزر و سیاسەت، بەرە و ڕۆشنبیرێکی هاوچەرخ، و : محەمەد وەسمان، دەزگەی O.P.L.C بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر، ٢٠٠٥ز، ل ١٧.

کۆدەنگیەك هەیە لەسەری و پێناسەیەکی بڵاوە لەم بوارەدا کە دەڵێ (ڕۆشنبیریی گوزارشتە لە سیستەمێکی تەواو لەو هەڵسوکەوتانەی بەدەستهاتوون، کە لە ڕێگەیەوە تاکەکانی نێو کۆمەڵگەیەکی پێ پۆلێن دەکرێت) [٦].

ڕۆشنبیریی پێویستییەکی ژیانە بۆ هەموو مرۆڤێك، ڕەوتێکی بەردەوامە لەناو هەموو کۆمەڵگەیەکدا کە پاڵنەری سەرەکیی بەرەوپێش بردنی کۆمەڵگەیە لە ڕووە جۆر بەجۆرەکانەوە، ئەو بەرئەنجام و بەرهەمانەش کە لە ڕێگەی ڕۆشنبیریی و بزاڤێکی لەم چەشنەوە بە دەستدێت موڵکی مرۆڤایەتییە و هەموو کەسێك بۆی هەیە سوودی لێ وەربگرێ و بەکاری بێنێ بۆ بەرژەوەندیی گشتی.

(٦) د.عبداللة احمد الذيفاني، مصدر السابق، ص ١٣.

## (١-١-٢) پێناسەی ڕۆشنبیر:

بە پێویستیی دەزانین ئەگەر بەشێوەیەکی کورتیش بێ تیشکێك بخەینە سەر ڕۆشنبیر و باسێکی لێوە بکەین تاوەکو بزانین ڕۆشنبیر کێیە؟ و بە چ کەسێك دەوترێت ڕۆشنبیر؟.

ڕۆشنبیریی فاکتەرێکی پێشکەوتنی مرۆڤەکانە لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ گەیشتن بە پسپۆڕی و کارامەیی و داهێنانکاری لە پێناو پێشکێش کردنی هونەرێکی گەورە.

لە ڕووی زمانەوانییەوە ڕۆشنبیر لە دوو وشە پێکهاتووە و وشەیەکی لێکدراوە. وشەی (ڕۆشن) لە زمانی کوردیدا واتە ڕووناك، وشەی (بیر) واتە هزر، واتە ڕۆشنبیر بەیەکێ دەوترێت، کە هزری ڕووناك بێ و خاوەن هزر بێ، کەواتە خاوەن هزر و ڕووناکبیر و ڕۆشنبیر یەك واتایان هەیە. پێناسە و ناساندن زۆرە بۆ چەمکی ڕۆشنبیر، لێرەدا ڕاڤەکردن و ڕای چەند هزرڤانێك دەخەینە ڕوو سەبارەت بە زاراوەی ڕۆشنبیر، ڕۆشنبیر لەلای زانای کۆمەڵایەتی ئەمەریکی "پارسۆنز" بەم چەشنە پێناسەکراوە کە دەڵێت: (ڕۆشنبیر ئەوانەن کە پسپۆڕن لە کاروباری ڕۆشنبیریدا و بایەخدانیان بە پرسەکانی ڕۆشنبیریی دەخەنە پێش هەموو پێوەرێکی کۆمەڵایەتیی ڕۆژانەی دیکەوە)[٧].

"ژولین بێندا" هزرڤانی فەرەنسی دەڵێت: (ڕۆشنبیران وەکو گرووپێکی بچووکی شا و فەیلەسووفان ناو لێ دەنێت، کە خاوەن تواناکارێکی زۆر باش و بەهرەمەندە ڕەوشتییەکانن)[٨].

---

(٧) خالید خاڵ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٠.

(٨) سۆران علیپور، ڕۆشنبیر کێیە؟ چارەنووسی چییە؟، کۆمەڵەوتار ، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧ز، ل ٣٣.

واتە خودان بەهرەیەکی زۆر و بەهایەکی باڵاکان، ئەو کەسانەن کە ویژدانی مرۆڤایەتی چێ دەکەن.

"ئەدوارد شیلز" لەبارەی ڕۆشنبیرانەوە دەڵێ: (ئەو توێژەی نێوان فێرخوازەکانن، کە خواستی سیاسییان هەیە چ ڕاستەوخۆ بە کۆششکردن بۆ ئەوەی ببن بە چاکی کۆمەڵگەکەیان (دەستەبژێری کۆمەڵگەکەیان)، یان ناڕاستەوخۆ بە کۆششکردن بۆ دارشتنی ویژدانی کۆمەڵگەکەیان و کارکردن بەسەر دەسەڵاتی سیاسی لە بڕیاردانی گەورەدا)[(٩)].

"کاستۆریادیس" لە پێناسەی ڕۆشنبیر دا دەڵێت: (ڕۆشنبیران کەسانێکن کە هەر پیشەیەکیان هەبێت، تێدەکۆشن بواری پسپۆڕیان تێپەڕێنن و کارایانە گرینگی بەو شتانە بدەن، کە لە کۆمەڵگەکەیاندا ڕوودەدات و بە گوتاریان و بە خستنەڕووی ڕاشکاوانەی بیروڕای گشتییان توانیویانە یان دەتوانن کار بکەنە سەر گۆڕانی دیاردەکانی نێو کۆمەڵگەکەیان)[(١٠)].

بەم پێیە زاراوەی ڕۆشنبیر بۆ ئەو کەسانە بەکاردێت کە زانیارییان هەبێ لە بوارە جۆر بەجۆرەکاندا و جێ پەنجەیان دیار بێت بەسەر کایە جۆربەجۆرەکانی ژیانەوە، خودی چەمکی ڕۆشنبیر پێوەرێکی ڕۆژئاواییە و هەڵقوڵاوی ئەزموونی ژیاری ڕۆژئاوایە، هەرچی ڕۆشنبیرە کەسانێکی هەڵگری بیر و باوەڕێکن.

---

(٩) وەرگیراوە لە: فازل عومەر ڕەشید، ڕۆڵی ڕۆشنبیر لە شەڕی ناوخۆدا، گۆڤاری خامە، گۆڤارێکی ئەکادیمی زانستی قوتابیانەی وەرزییە، سەنتەری خامە بۆ ڕاگەیاندن و لێکۆڵینەوەی قوتابیان دەری دەکات، هەولێر، ژمارە (٢)، زستانی ٢٠٠٦ز، ل ٦٣.

(١٠) ڕامین جەهانبەگلو، مۆدێرنەکان، و: ئازاد بەرزنجی، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩ز،ل ٣١.

دەتوانین ئەم چەند خاڵە وەکو پێوەرێك بۆ ڕۆشنبیریی سەرکەوتوو دەستنیشان بکەین:
١ــ دانانی بەرنامەیەکی گونجاو بۆ خۆڕۆشنبیرکردن، هەروەها بۆ بڕیاردان و هەنگاونان و دەست بەکاربوون، داڕشتنی پلانێکی گونجاو بۆ خۆڕۆشنبیرکردن کە تیایدا ئامانجی خۆی دیاری بکات.
٢ـ بەشداریکردن و ئامادە بوون لە کۆبوونەوە گشتییەکاندا وەکو کۆڕ و سیمینار، دیارکردنی کاتێکی گونجاو بە شێوازێکی بەردەوام بۆ خوێندنەوە.
٣ـ کارکردن لە پێناو پێشکێش کردنی هونەرێکی گەورە، هێزێکی نوێ بۆ چاکسازی (کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی و...هتد) ئەمەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی تواناکانی ڕۆشنبیر، بۆ لابردنی تاریکی و لێڵی لەسەر ڕاستییەکان.
٤ـ ئاراستەکردنی ڕەخنەی بونیادنەرانە و قوڵبوونەوە لە هەموو بارێکی مەعریفی، ئەمەش پێویستیی بە پسپۆڕی و زانیاریی تەواو هەیە بۆ خوێندنەوە و تاوتوێکردنی ڕووداوەکانی ڕۆژگار.
٥ـ ڕۆشنبیر کەسێکی ئارام و دان بەخۆداگرتووە، ئەرکی سەر شانیشی بەردەوام هەوڵدان و سەرکەوتنە بەسەر گرفتەکان، تاکو دەبێتە خاوەن داهێنانێکی نوێ.
٦ـ سوود وەردەگرێت لە هەموو سەرچاوە زانستی و زانیارییەکان و هەوڵی دۆزینەوە و بەدەستهێنانی زانیاریی ورد دەدات.
٧ـ ڕۆشنبیر تامەزرۆی فێربوون و خوێندنەوەی بەردەوامە و هەوڵ دەدات هەل و دەرفەتە زێڕینەکان بۆ بەرژەوەندی گشتیی بقۆزرێتەوە و بە پێی گونجان و پێویستیی زانیاریی خۆی بلاو دەکاتەوە.
٨ـ خۆڕاهێنان و گەڕان و بەدواداچوون بەدووی سەرچاوەی نوێ و لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکان و خوێندنەوەی کەتوارییانە لەبارەیانەوە.
٩ـ هەوڵدان بۆ کۆکردنەوە و پێکەوە گرێدانی بابەتە هاوچەشنەکان، چێکردن و بەرهەمهێنانی بابەتی نوێ و پێوەندیدار بۆ کەتواری کۆمەڵگە، قسەکردن لەبارەی تەنگژەکان و ڕێگەچارەکان.

## (١-١-٣) ئەركەكانی ڕۆشنبیری.

كۆدەنگییەك لە نێوان زانایان و لێتۆژان بەدی دەكرێت لەبارەی ئەركەكانی ڕۆشنبیریەوە، كەوا ڕۆشنبیریی كۆمەڵێك ئەرك بەرهەم دەهێنێت :

١ـ دیاركردنی دەروازە و ڕێگەیەك بۆ ئەوەی مرۆڤەكان بتوانن پێداویستییەكانیان تێربكەن و بەدەستی بهێنن.

٢ـ دیاركردن و پێناساندنی ئەو شێوە و ڕێسا باوانەی كەوا مرۆڤەكان دەیبەخشێت بە نەوەكانی دواتر.

٣ـ میكانیزمەكانی فێركردن.

٤ـ دابەشكردنی كەرەستە بنەڕەتییەكان كە بەردەوامی بە ژیان دەدات.

٥ـ دیاركردنی ڕێگە و دەرچەیەك كە پێوەندییە مرۆییەكان ڕێكدەخات لە كۆمەڵگەیەكدا.

٦ـ بە دەستهێنانی ژیانێكی هاوبەش لەنێوان تاكەكان لەگەڵ یەكدی، مانەوە لەسەر بنەمای پاڵنەر و بەرگرییەكان لە لای تاكەكان لە میانەی هاوكاریكردن لە كارەكاندا تاكو ڕەوتی ژیان بەردەوام بێت [11].

---

(١١) أ.د.عبداللة أحمد الذيفاني، مصدر السابق، ص ١٣.

## (٤-١-١) جۆرەکانی ڕۆشنبیریی:

ئاماژەمان بەم زاراوەیە دا وەکو فۆرمێکی گشتیی و ئەوەمان خستەڕوو، کە ڕۆشنبیریی برێتییە لەو برە زانیارییە بنەڕەتییەی، کە هەر تاکێك لە تێکڕای بوارەکاندا هەیەتی، بەڵام بەشێوەیەکی گشتیی ڕۆشنبیریی بۆ دوو جۆری سەرەکیی پۆلێن دەکرێ لەسەر بنەمای ئەو بابەتانەی کە لە خۆی دەگرێت، هەروەها بەگوێرەی ئەو دابەشکردنە مەعریفییەی مرۆڤەکان بۆ بابەت و بوارە جیاوازەکان.

**یەکەم: ڕۆشنبیریی (مرۆیی):** بابەتە مرۆییەکان لە خۆدەگرێ وەکو زانستە کۆمەڵایەتییەکان و زانستە مرۆییەکان و هەندێ لێکۆڵینەوەی دەروونی و فەلسەفی، هەروەها لێکۆڵینەوەی ئەو بێژە و گوتە کاریگەرانەی کە بە جوانکاری لە دەربڕیندا ناسراون، کە خۆیان لە ڕەوانبێژی، شیعر، چیرۆك و ڕۆمان دەبیننەوە.

**دووەم: ڕۆشنبیریی زانستی:** ئەم جۆرە ڕۆشنبیرییە پتر مەبەست لێی لێکۆڵینەوە و بوونی زانیارییە لەسەر بابەتە زاستییەکانی وەکو (فیزیك، کیمیا، زیندەوەرزانی، بیرکار و...هتد[١٢].

ئەم جۆرە پۆلێنکردنەی ڕۆشنبیریی لە مێژوودا شتێکی نوێیە و لەسەردەمانی کۆندا فەیلەسووف و هزرڤانان هەردوو جۆرەکەیان پێکەوە کۆکردۆتەوە، بەڵام لەم چەند سەدەی دواییدا دوای ئەوەی زانست بەشێوەیەکی بەرچاو گەشەی کرد و مەعریفە مرۆڤایەتیەکان فرەوانبوون و چەندین لقیان لێ دروست بوو، بۆیە ڕۆشنبیریی لە توانایدا نەبوو بە شێوەیەکی گشتیی بایەخ بە تێکڕای لایەنە جیاجیاکانی ڕۆشنبیریی

---

(١٢) بەهرام محەمەد کاکل، ڕۆشنبیری...کۆمەڵگەی مەدەنی، چاپی یەکەم، چاپخانەی بینای، سلێمانی، ٢٠٠٦ز، ل ١٢ – ١٣.

بدات، بگرە پەنایان بردە بەر پسپۆڕی لە لقێك لە لقەكانی زانست و ڕۆشنبیریی. بەم چەشنەش لەسەر بنەمای جۆری بابەتـەكان هەسـتان بـە دابەشـكردن و پـۆلێنكردنی ڕۆشنبیریی بەسەر ئەو دوو جۆرەدا، لەم نێوەندەشدا ڕۆشنبیریی سیاسی لە چوارچێوەی جۆری یەكەمدا باسی لێوە دەكرا.

## (٢.١) ڕۆشنبیریی سیاسی Political Culture

### (١.٢.١) پێناسەی ڕۆشنبیریی سیاسی

بێگومان یەكێك لە گرفتەكانی زانستی سیاسـەت پێناسـەكردنی زاراوەكـانی نێـو ئـەو دەرەتانەیە، لەبەرئەوەی ڕێكەوتنێك نییە لە نێوان ئەو هزرڤانان و لێتۆژانەی سەرقاڵن لـەم زانست و بوارەدا. بۆیە زاراوەی ڕۆشنبیریی سیاسیش لەم گرفتە بەدەر نییـە، چـونكە لـە بنەڕەتدا تەباییەك لەسەر پێناسە و واتـای چـەمكی ڕۆشــنبیریی نییـە لەلایـەن زانایـانی ئەنترۆپۆلۆجیا و كۆمەڵناسان لەلایـەك و لەبـەر نوێبـوونی زاراوەی چـەمكی ڕۆشــنبیریی سیاسی لەلایـەكی دیكـەوە، بـەڵام هەرچـۆنێك بێـت ڕۆشــنبیریی سیاسـی بەشـێكە لـە ڕۆشنبیریی گشـتیی و یەكێكـە لـە ئـامرازە سـەرەكییەكانی كـار و چـالاكی سیاسـی و پێوەرێكە بۆ پێگەیاندنی سیاسـی و كاریگـەری دەبـێ لەسـەر پلـەی بەشـداری سیاسـی هاووڵاتییان لە دەوڵەت و كۆمەڵ و پارت و ڕیكخراو و یەكە جۆربـەجۆرەكان دا. چـەندین پێناسەی جۆراوجۆر و جیاواز بۆ چەمكی ڕۆشنبیریی سیاسی كراوە لەوانە:

گابریل ئەلمۆند بەم شێوەیە پێناسەی ڕۆشنبیریی سیاسی دەکات و دەڵێت: (ڕۆشنبیریی سیاسی بریتییە لە دابەشکردنێکی تایبەت بە ڕێنماییە سیاسییەکان، بەهاکان، هەستەکان، زانیارییەکان و بەهرەکان کە کاریگەریی لەسەر ڕەوشتی تاکەکان دەکات، هەروەها ڕۆشنبیریی نەتەوەیی سیاسیش کاریگەرە لەسەر ڕەوشتی هاوولاتییان و سەرکردەکان و لە ڕێگەی سیستەمی سیاسی) [١٣].

ئەلموند ڕۆشنبیریی سیاسی بە جۆرێك باسی لێوەدەکات کە پەیوەندیی بە بەها دیموکراتییەکانەوە هەیە و ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لە فەراهەمکردنی دیموکراتی، پێی وایە گرینگی و چییەتی ڕۆشنبیریی سیاسی لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی دیکە جیاوازە، چونکە لایەنی مۆراڵی و کۆمەلایەتی و ئابووری و ئاینی و جۆراوجۆر هەیە لە نێوان دەوڵەتەکاندا، کە ئەستەمە ڕۆشنبیرییەکی سیاسی گشتیی وەك یەك هەبێ لە هەریەك لە دەوڵەتانی خاوەن شارستانی، کە ئاستێکی نزمیان لە ژیانی شارستانییەت هەیە.

لوشیان بای لەبارەی ڕۆشنبیریی سیاسییەوە دەڵێ: (ڕۆشنبیریی سیاسی کۆمەڵێك بیروباوەڕ و هەستە، سیستەمێك و واتایەك دەبەخشێتە پرۆسەی سیاسی، ئەو ڕێسا جێگیرانە دێنێتە ئاراوە کە حوکم دەکات لەسەر هەڵسوکەوتی تاکەکان لەناو سیستەمی سیاسییدا. واتە ڕۆشنبیریی سیاسی بەپێی ئەم بۆچوونە ئەو پێوەر و نموونە سیاسییانە دەگرێتەوە کە ئەندامانی کۆمەڵێکی سیاسی پێوەی پابەندن) [١٤].

(١٣) نقلا عن : جابريل أية الموند وجى.بنجام باويل الابن، السياسات المقارنة في وقتنا الحاضر، ت: هشام عقبدولآ، الطبعة الاولى، الدار الاهلية للنشر والطبع، عمان، ١٩٨٨م، ص ٦٩.

(١٤) د. کەمال مەنوفی، تیۆری سیستەمە سیاسییەکان، و: ئاوات ئەحمەد، چاپی یەکەم، چاپخانەی یاد، شوێن نەنوسراوە، ٢٠٠٧ز، ل ٢٠٣.

واتــە کرۆکــی ڕۆشــنبیریی سیاســی لــە بــەها و و ئاراســتە و ڕفتــار و زانیارییــە سیاسییەکانی تاکەکانی نێو کۆمەڵگە سەرچاوە دەگرێ، بەمەش ڕۆشنبیریی سیاســی گوزارشت دەکات لە توخمە مەعنەویەکان.

مــوریس دوفرجیــە هزرڤــانی فەرەنســی لــەبارەی ڕۆشــنبیریی سیاســییەوە دەڵێــت: (ڕۆشنبیریی سیاسی بە شێوەیەکی گشتیی لایەنی سیاسی ڕۆشنبیرییە، بەو شێوەیەی کە خۆی کۆمەڵە ڕێکخستنێکی ڕۆشنبیرییە) [15]

جیمس ئەندرسـون بـەم چەشـنە پێناسـەی ڕۆشـنبیریی سیاسـی دەکـات و دەڵێـت: ڕۆشنبیریی سیاسی بریتییە لەو بەشەی ڕۆشنبیری کۆمەڵگە، کە ئـەو بـەها و داب و نەریتانە لە خۆدەگرێت کە پێوەستە بەوەی حکوومەت چۆن کارەکانی بکات، لەگـەڵ ئەوەشدا سرووشتی پێوەندی نێوان هاوولاتی و حکوومەت ڕوندەکاتەوە).

فیلپ برو ڕۆشنبیریی سیاسی بەم شـێوەیە دەناسـێنێ (ڕۆشـنبیریی سیاسـی کۆمـەڵێك زانیاریی و بیر و باوەڕە، کە ڕێگە بە تاك دەدات کە واتایەك بـەو ئەزموونـە ڕۆتینییـە ببەخشێت کە پێوەندی بەو دەسەڵاتەوە هەیە، کە حوکمڕانیان دەکات، هـەروەها ڕێگـە بە گرووپەکان دەدات وەك ژێدەرێك بـۆ ناسـاندنی ناسـنامەیان بـەکاری بهێـنن و لـە هەمانکاتدا وەك سەرچاوەیەك ناوی بنێنن ڕۆشنبیریی سیاسی) [16]. کەواتە ڕۆشنبیریی سیاسی دەرفەت بە هەر تاکێك دەدات کە پێگە و سەنگی خۆی لـە بـواری سیاسـییدا دیار بکات.

---

(١٥) نقلا عن: د. عبدالله محمد الرحمن، علم الاجتماع السياسيي، الگبعه الاولی، دار النهچه العربیه، بیروت، ٢٠٠١م، ص ٤٣٦.

(١٦) عوسمان عەلی حەسەن، بەشداری سیاسیی (لێکۆڵینەوەیەکی سیاسیی کۆمەڵایەتی یاساییە) گۆڤاری یاسا و ڕامیاری، گۆڤارێکی نیو ساڵانەیی زانستییە، لەلایەن کۆلێژی یاسا و ڕامیاری زانکۆی سەلاحەدین دەردەچێت، ساڵی شەشەم، ژمارە(٤)، ٢٠٠٨ز، ل ٨٥.

رۆشنبیریی سیاسی لقە رۆشنبیرییە و لقێکە لە رۆشنبیریی گشتیی کۆمەڵگە، کاریگەریی لەسەر کۆمەڵگە هەیە و کاریگەری ئەویشی لەسەر دەبێت، بەڵام ناتوانێت لە دەرەوەی چوارچێوەی گشتیی کۆمەڵگە بێت، واتە رۆشنبیریی سیاسی لە دەوری ئەو بەها و بڕوایانە دەسورێتەوە، کە لە کۆمەڵگەدا باڵادەستن و کاریگەرییان هەیە لەسەر ئەندامەکانی جا چ حوکمڕان بن یان حوکمڕانیکراو.

رۆشنبیریی سیاسی لە هەر کۆمەڵگەیەکدا بەوە جیادەکرێتەوە کە لە گۆڕاندایە و بە رەهایی جێگیر نییە، لێرەشدا قەبارە و ڕادەی گۆڕانەکەی گرێدراوی چەند هۆکارێکە کە لە کۆمەڵگەدا بوونیان هەیە [١٧].

بۆیە رۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەیەکانەوە بۆ ئەوی دیکە جیاوازە و دەگۆڕێت هەروەها لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە جیاوازە ئەو جیاوازییەش جۆراو جۆر دەیسەپێنن وەك (بنەچە، ڕەگەز، شوێنی نیشتەجێبوون، پیشە، ئاستی خوێندن، باری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە و...هتد).

## (١-٢-٢) ڕەهەندەکانی رۆشنبیریی سیاسی.

بەشێوەیەکی گشتیی دەتوانین سیٚ جۆر لە ڕەهەندی رۆشنبیریی سیاسی دەستنیشان بکەین و باسی بکەین کە بریتین لەم ڕەهەندانەی خوارەوە.

١ـ ڕەهەندی مەعریفی Cognitive[١٨]: یەکەم ڕەهەندە کە دەبیٚ بیری لیٚ بکرێتەوە، رۆشنبیریی سیاسی کۆمەڵێك زانیاریی لەخۆ دەگرێت لەبارەی

---

(١٧) کنێر عەبدوڵا، بەشداری کردن لەنێوان رۆشنبیری و پەروەردەکردندا، گۆڤاری سەردەم، گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کولتووری بیانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ساڵی دەیەم، ژمارە(٥٥)، هاوینی ٢٠٠٨ز، ل ٤٩.

سیستەمی سیاسی، کۆمەڵێ مەعریفە و ادراکی هەیە لەم ڕووەوە، لە هەمانکاتیشدا هەر تاکێك نەخشەی زانیاریی و ورد و جیاوازی هەیە بۆ دیاردە و ڕووداوە سیاسییەکان، کە ئەو زانیارییانە دەزگەکانی سیاسەتی لەناو وڵات پێ پێناسەدەکرێ، تاکەکان بەزانیاری جیاوازەوە دەپرسن دامەزراوە سیاسییەکانی وڵاتەکەی چین و کامانەن، کێن ئەو کەسانەی کە دەسەڵاتی ڕاستەقینەیان لایە و ڕۆڵ دەگێڕن، چۆنییەتی پۆلێنکردنی حزبە سیاسییەکان و ئاراستە سیاسییە جیاوازەکان و...هتد، کەواتە ڕەهەندی مەعریفی سەرجەم ئەو زانیارییانە دەگرێتەوە کەلای تاك کۆ بۆتەوە بۆناسینی دیاردە سیاسییە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگەکەی کەئەوەش ڕۆشنبیرییەکی سیاسی لابنیات دەنێ [19].

٢ـ ڕەهەندی سۆزگەرایی Affectife: هەرچەندە ئەم ڕەهەندە لە چاو ڕەهەندی مەعریفی کەمتر ڕوونە، بەڵام گرینگی لەو کەمتر نییە بۆ دیارکردنی هەڵوێستی سیاسی، کە تیایدا یان هەستێکی سۆزداری سەرسامبوون بەسیستەمی سیاسی دێنێتەدی، یان ڕق لێبوون و ڕەتکردنەوە، بەهەند وەرنەگرتنی کاروباری دامەزراوەکان و بویەر و دیاردە سیاسییەکان دێتەپێش لەسەر بنەمای سۆز و هەستی تاك بەرامبەر دامەزراوە سیاسییەکان، بۆ نموونە گومان لەوەدا نییە کە وا زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگە سەیری تەلەڤیزیۆن دەکەن و گوێ لە ڕادیۆ دەگرن و ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە، ئەو شتانەی کە لەو کەناڵانەوە پێیاندەگات کاریگەری لەسەریان دەبێت، بەڵام ئەم کاریگەرییە ناگاتە ئاستی ئەو کاریگەرییەی کە سەرکردەی سیاسی نەتەوەیی کاریزمی هەیەتی، لەبەرئەوەی هاووڵاتییان بە شێوەیەکی سۆزداری پێوەی بەستراونەتەوە.

---

(١٨) ادراکی، (Cognitive) مەبەست لێی مەودای ئەو زانیاریانەیە کە تاك لەبارەی مەبەستە سیاسییەکان هەیەتی.

(١٩) د. کەمال مەنوفی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٣.

٣ـ ڕەهەندی هەڵسەنگاندن **Evaluative**: ئەم ڕەهەنـدە بڕیـارە گرینگـەکان لـە خـۆدەگرێ لـەبارەی دیـاردە سیاسـییەکان، کـە هـەر تاکێـك ژیـانی سیاسـی هەڵدەسەنگێنیێ لەسەر بنەمای کۆمەڵێ بنەمای لێکدراو زنجیرەیی، کە دواجار بڕیار دەدات بە قبوڵکردن و بڕواپێبوون یان ڕەتکردنەوە بڕوا پێ نـەبوون، کـە بەگشـتیی توخمـەکانی ڕەهەنـدی هەڵسـەنگاندن پێکـدێت لـە (بـەهاکان، بیروباوەڕەکـان، پرەنسـیپەکان، نموونـە باڵاکـان، ئـەو ئایدیۆلۆژیایانـەی، کـە کاریگەریی نابێت لەسەر ڕەفتاری سیاسی) [٢٠].

## (١.٢.٣) جۆرەکانی ڕۆشنبیریی سیاسی:

بەپێی ئەم تێگەشتنە لە ڕۆشنبیریی سیاسی بـە پێناسـە و ڕەهەندەکانییـەوە جـۆرە ڕۆشـنبیرییەکی سیاسـیمان پـێ دەبەخشـێت، کـە خەسـڵەتەکانی لـەنێو دەوڵـەت و کۆمەڵگەکاندا جیاوازە، بۆیە پۆلێن کردنی شـێوە و جۆرەکـانی ڕۆشـنبیریی سیاسـی گرینگە.

بەم پێیە گابریل ئەلمۆند و سدنی فربا سێ جۆر لە ڕۆشنبیریی سیاسی دەستنیشـان دەکـەن بەم شێوەیەی خوارەوە [٢١].

١ـ ڕۆشـنبیریی سیاسـی سـەرەتایی Parochial Culture: ئـەم جـۆرە ڕۆشـنبیرییە لـەو کۆمەڵگە سەرەتاییانەدا بوونیان هەیە، کە گەشـەکردنیان لاواز و کەمـە، کـە تیایـدا ئاراستە و ڕۆڵی هاووڵاتییان بەرامبەر پرسە سیاسییەکان زۆر کەمە و لـە ئاسـتێکی نزم دایە. خەڵکی شتێکی ئەوتۆ کە شیاوی سـەرنج و ئامـاژە پێکـردن بـێ نـازانن،

---

(٢٠) د . کەمال مەنوفی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٣.

(٢١) د.کەمال مەنوفی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٥ تا ٢١٨. وە ، عوسمان عەلی حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٧ تا ٨٩.

لەبارەی ئامانج و مەبەستە سیاسییەکان کەلە ژیانی سیاسییدا هەیە و وە ناتوانن هیچ حوکمێکی تەندروست بدەن لەبارەیانەوە، هیچ کاریگەریان لەسەر کۆی سیستەمی سیاسی و بەڕێوەبردنی کار و چالاکییەکانی نییە، خەڵکی لەم جۆرە ڕۆشنبیرییە کە لە کۆمەڵگە خێڵەکی و سەرەتاییەکاندا هەیە یان لەو کۆمەڵگە نوێیانەی کە پرۆسەی تەواوکاری یان تەواو نەکردووە، یان لەو دەوڵەتانەشدا کە لە قۆناخی سەرەتایی بونیادنانی سیاسییدان و ناتوانن لەگەڵ سیاسەتی گشتییدا بن و ڕۆڵێکی چالاکییان هەبێ، بەواتایەکی دیکە ئەم جۆرە ڕۆشنبیرییە ناوچەییە و ڕۆشنبیرییەکی نیشتمانی نییە، هەر لە دەستپێکەوە ئاراستەی تاکەکان لەبارەی ئامانجە سیاسییەکان لێك نێزیك دەبنەوە و هەمان هەڵوێستیان بەرامبەر سەرکردە سیاسییەکان دەبێت.

٢ـ ڕۆشنبیریی سیاسی پاشکۆیەتی Subject Political Culture: ئەم جۆرە ڕۆشنبیرییەش ناتوانێ بە تەواوەتی ڕۆشنبیرییەکی نیشتمانی بونیاد بنێ، بەڵام هاوولاتی تیایدا هۆشمەند دەبێت بە سیستەمی سیاسی[٢٢] و ئەو کارانەی کە دەیکات، کە جاری وا هەیە تاك پێی خۆشحاڵ دەبێ یان ڕقی لێ دەبێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا هەستێکی لاواز و سادەیە بۆ چالاکی سیاسی لە هەمانکاتدا دامەزراوەکان وەڵامیان زۆر کەمە بەرامبەر پێداویستیەکانی تاکەکان، لە لایەکی دیکەوە ئەم جۆرە

---

(٢٢) "گابریل ئەلمۆند" پێناسەی سیستەمی سیاسیی دەکات بەوەی "سیستەمی سیاسیی سیستەمێکە لە کارلێکردن و ئاوێتەبوونەکان، کە لە هەموو کۆمەڵگەیەکی سەربەخۆدا بوونی دەبێ، پەیوەستیشە بەکار و فرمانی (کاملبون و گونجاندن) جا چ لەسەر ئاستی ناوەخۆبێ واتە لەناو چوارچێوەی کۆمەڵگەکەدا یان لەسەر ئاستی دەرەکیدا واتە لە نێوان ئەو کۆمەڵگەیە و کۆمەڵگەکانی دیکە ئەمەش لە ڕێگەی بە کارهێنانی بەکردەوەی هۆکار و ئامێرەکانی زەبروزەنگی ڕەوا". وەرگیراوە لە: عومەر حەمەدەمین نوردینی، سیستەمی نوێی جیهانی و دۆزی کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٣ز، ل٣٠.

ڕۆشنبیرییە (ڕۆشنبیریی ملکەچگەرای)شی پــێ دەگــوترێ بــەو واتایــەکی پێوەنــدیی فەرمان لەسەرکراوەکان بە سیســتەمی سیاســییەوە پێوەندییــەکی ملکەچــییە، بــەم شێوەیە فەرمان لەسەرکراوەکان ئاگایــان لــە دەســەڵاتی حکوومــەت دەبێــت، بــەڵام ناتوانن بەشداری کارا بکەن لە سیستەمی سیاسییدا، چونکە باوەڕیان وایە کە هــیچ نرخێك بۆ ڕۆڵیان دانانرێت جا بەهۆی دانپێدانەنانی سیستەم بێ بە بەشــداریان، یــان دانپێدانان بە توانای لاوازی و بەرئەنجامی ئەو کاریگەرییەی کە بۆ هەر یەکە لە input و output (تێهاویشتەکان و دەرهاویشتەکان)[٢٣] کە لە سیســتەمی سیاســییدا هەیــە، هەروەها ئەم جۆرە کولتوورە لەو کۆمەڵگەیانەدا هەیە و باوە کەوا دەستەی بەڕێوەبردنی وڵات هەژموونێکی تەواویان هەبووە بەســەر زۆرینــەی کاروبارەکــانی کۆمەڵگــە، بــەو شێوەیە سەیری خۆیان دەکەن کەوا بەشێکن لە سیستەمی سیاسی و کاریگەریی تەواوی بەسەریانەوە هەیە و تاکەکانی ناو ئەم کۆمەڵگەیانە خاوەنی ویستی سەربەخۆی خۆیــان نین، پرۆسە سیاسییەکان بەشێوەیەکی ڕۆتینی بــەڕێوە دەچــن، تاکــەکانی کۆمەڵگــەش ڕۆڵێکی ئەوتۆیان لە گۆڕانکارییەکان یان خستنە ژێر پرســیاری پرۆســە سیاســییەکاندا

---

(٢٣) "دیڤید ئیستۆن" بەم شێوەیە باس لە تێهاویشتەکان و دەرهاویشتەکان دەکات بە جۆرێك کە، ( input): بریتین لەو پاڵەپەستۆ و کاریگەرییانەی کە سیستەمی سیاسی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە و پاڵی پێوە دەنێن بۆ چالاکی و جووڵە.ئەم تێهاویشتانە لە ژینگە و ناو خودی سیستەمەکەشەوە هەڵدەقوڵێن، هەموو سیستەمێکیش کراوەیە بۆ وەرگرتنی کاریگەرییەکانی ئەو ژینگەیەی کە تێیدا دامەزراوە.

**(output)**:بریتییە لە وەڵامدانەوەی سیستەم بۆ داواکارییە کردەییەکان یان پێشبینیکراوەکان، بەواتایەکی تر بریتیە لەو سیاسەت و بڕیارانەی کە پێوەندییان هەیە بە دابەشکردنی سامانەکانەوە، لەوانەیە دەرهاویشتەکان بە یەکێك لەم شێوانە بێت (ئەرێ، هێمایی، نەرێ) وەرگیراوە لە: د. کەمال مەنوفی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٠

نییە، بگرە ملکەچی هەموو بڕیارەکانن و بێدەنگی و وەستاوی بـاڵ دەکێشـێت بەسـەر گشت ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی دا [٢٤].

٣ـ ڕۆشنبیریی سیاسی بەشداریکردن Participation Political Culture: ئـەم جـۆری ڕۆشنبیرییە بە پێچەوانەی هەردوو جۆری پێشترە، کە باسمـانکرد، هاووڵاتییـان لـەم جـۆرە ڕۆشـنبیرییەدا وای دەبیـنن کـە دەرفـەتی بەشـدارییان لـە ژیـانی سیاسـی و سیستەمی سیاسییدا زۆرە، لە بەرئەوەی هاووڵاتی لە ئاسـتێکی بـەرزی هۆشمەنـد و هۆشیاری دایە بەرامبەر کاروباری سیاسی، ڕۆڵی کاریگـەر دەگێڕێـت و کاریگـەریی دەبێت لەسەر سیستەمی سیاسی، دەتوانن ئـەو سیسـتەمیەش بگـۆڕن و هـەمواری بکەن لە ڕێگەی کار و چالاکی جۆراوجۆر و چالاکی کاری سیاسییانەوە، ئەمەش لـە ڕێگەی ئـامرازە جۆربـەجۆرەکانی بەشـداری سیاسـییەوە دەبێـت وەك هەڵبـژاردن و خۆپیشاندان و نارەزای دەربڕین و بەشداری لە حزبی سیاسـی و گرووپـەکانی فشـار و پێکهێنانی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی و کۆمەڵگەی و...هتد.

بەکورتی دەتوانین بڵێین کە چەمکی (ڕۆشنبیریی سیاسی بەشداریکردن)، دەتوانێ ئەوە دیار بکات کە پێی دەوترێ (چاوەڕوانییەکانی دیموکراتی)، زانینی ئـەوەی کـە تـا چ ئاستێك سیسـتەمی حـوکمی سیاسـی دەتـوانێ بـە وەڵامدانـەوە بـۆ پێداویسـتی و بەرجەسـتەکردنی پێداویسـتییەکانی تـاك و بـەدیهێنانی بـۆ ئەوانـەی کـە لـە کۆمەڵگەیەکدان بەو پێیەی کە ئەندامی بەشدار و کارای ئەو کۆمەڵگەیەن.

---

(٢٤) سەروەر محەمەد عەبدوڵا، کۆسپەکانی بونیادنانی کولتووری بەشداریکردن، گۆڤاری هێشتا، هەڵەبجە، ژمارە ٦ و ٧، ٢٠٠٧، ل ٤ و ٥ .

### (١-٢-٤) ئەركە سەرەكییەكانی ڕۆشنبیریی سیاسی:

ڕۆشنبیریی سیاسی كۆمەڵێك ئەركی سەرەكیی لە خۆدەگرێ كە دەروازەیەك دەكاتەوە بۆ باسكردن و دەرخستنی زۆرێك لە ئامانجە گشتییەكانی سیستەمی سیاسی بۆ ئەوەی زەمینەسازی بكات لە پێناو بەدیهێنانی كۆمەڵگەیەكی دیموكراتی و شارستانی.

دەكرێت گرینگترین ئەركەكانی ڕۆشنبیریی سیاسی بەكورتی بەم شێوەیە بخەینەڕوو:

١. لێكۆڵینەوە لەبارەی ڕۆشنبیریی سیاسی هاوكاریمان دەكات بۆ ئەوەی لە پێكهاتە و ڕەگەزەكانی بونیادی سیاسی تێ بگەین كە لە هەموو كۆمەڵگەیەكدا بوونیان هەیە.

٢. ڕۆشنبیریی سیاسی یارمەتیمان دەدات بۆ شیكردنەوەی ئەو پێوەندییەی كە لە نێوان هاوولاتی و دەسەڵاتی سیاسیدا هەیە، كە لە ڕێگەیەوە جۆری ڕۆشنبیرییەكە لای جەماوەر و چاوەڕوانییەكانی جەماوەر لە دەسەڵاتی سیاسی دەزانرێ، تا چەندە دەسەڵاتی سیاسی یاخۆ حكومەت پێداویستییەكان دابین دەكات و ئەو ئامانجە سیاسییانەی كە خولیای جەماوەرە، ئەو جەماوەرەی كە خودان ڕۆشنبیرییەكی سیاسییە دەتوانێ دەسەڵات هان بدات بۆ دەستەبەركردنی پێداویستییەكانیان لە میانەی بەشدارییەكی كارا و چالاكی جۆراوجۆر، بە پێچەوانەی ئەو جەماوەرەی كە خاوەن بەشدارییەكی كلاسیكی بەرتەسكە.

٣. یەكێكی دیكە لە ئەركەكانی ڕۆشنبیریی سیاسی بریتییە لە لێكۆڵینەوە لەبارەی پرۆسەی بەشداری سیاسی و چۆنییەتی بەردەوامی و نوێكردنەوەی، ڕۆشنبیریی سیاسی ڕەگەزی هەرە سەرەكیی و بنچینەی گەشەپێدانی پرۆسەی بەشداری سیاسی و پەرەپێدانی سیاسییە، كە دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین كە پرۆسەی نوێبوونەوەی ڕۆشنبیریی سیاسی هاوكارمان دەبێت لە دروستكردنی جۆرێك لە پاڵنەرایەتی و كار و گەشەكردنی چالاكی دیموكراتی كارا لە ژیانی سیاسییدا، كە ئەمەش نایەتەدی ئەگەر لە ڕێگەی ڕۆشنبیریی و هۆشیاری سیاسی كۆمەڵەوە نەبێت.

٤. چێکردنی کەسایەتیی نیشتمانی یەکێکی دیکەیە لە ئەرکە سەرەکییەکانی ڕۆشنبیریی سیاسی، کە پرۆسەی بایەخدان بە ڕۆشنبیریی سیاسی بەشداری دەکات لە بەرەو پێشبردنی ڕێوشوێنەکانی بەشداری سیایی، پێشکەوتن و دەرچوون لە ڕۆشنبیریی دیارکراو بەرتەسك و سنووردار بۆ ڕۆشنبیرییەك کە خولیای بەشداری کردن بێت، چونکە ڕۆشنبیرییەکی سنووردار ڕەنگدانەوەی گوێ پێ نەدانی سیاسی و بەشداری نەکردنە لە چێکردنی بڕیاری سیاسییدا لەسەر ئاستی ناوچەیی یان نەتەوەیی ـ نیشتمانی، ئەمەش کاریگەری نەرێنی لەسەر دەرکەوتنی کەسایەتی نەتەوەیی دەبێت، کە جۆری ئەدای سیاسی و کۆمەڵایەتی لای جەماوەر بەرامبەر کێشە نیشتمانی و پرسە نیشتمانییەکانیان و دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی و ئامانجە گشتییەکانیان بەلاوازی نیشان دەدات.

٥. ڕۆشنبیریی سیاسی و مافی هاوولاتیبوون: دیارە تا ئاستی ڕۆشنبیریی بە واتا گشتیی و سیاسییەکەی بەرزبێت هاوولاتی باشتر دەتوانێت مافە سرووشتی و شارستانی و سیاسییەکانی دەستەبەر بکات و ڕۆشنبیرییەکی سیاسی ئەوتۆ پەیدا بکات، کە بەهۆیەوە بکارێت کارکرد و ئەرکی مافە سیاسییەکانی خۆی بکات وەك مافەکانی هەڵبژاردن و بەشداریکردن و بوون بەئەندام لە پارتە سیاسییەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی و خۆپیشاندان و نارەزای دەربڕین و...هتد، کە هەموو ئەمانە بەشداری دەکەن لە چێکردنی ڕۆحی هاوولاتیبوون کە خۆی لە چەندین ماف و ئەرك و بەرپرسیارێتی دەبینێتەوە دەهەمبەر بە کۆمەڵگە و بەشداریکردن لە ژیانی سیاسی و گەشەپێدان و نوێکردنەوەی بەشێوەیەك کە لەگەڵ ڕەوتی ژیان بگونجێ.

٦. ڕۆشنبیریی سیاسی و نوێگەرای: فراژووبوون و پەرەپێدانی گشتیی گومانی نییە کە پرۆسەی فێرکردنی سیاسی بەشێکە لە پێکهاتووەکانی پرۆسەی فێرکردن و ڕۆشنبیریی و پەروەردەی گشتیی کە تاك کۆششی بۆ دەکات و سیستەمی سیاسی پێشکەوتوو جەختی لەسەردەکاتەوە، یان ئەو سیستەمەی کە دەیەوێت کۆمەڵگە بەرەو پێشکەوتن و نوێبوونەوە بەرێت. کەواتە ڕۆشنبیریی سیاسی بەشداری لە

پرۆسەکانی گەشەپێدانی گشتیی وەك گەشەی ئابووری کۆمەڵایەتی و سیاسی دەکات، کەوابێ ڕۆشنبیریی سیاسی گرینگی هەیە بۆ گەشەپێدانی هەموو لایەنەکانی دیکەی ژیانی کۆمەڵ بەشێوەیەکی گشتیی [٢٥].

ڕۆشنبیریی سیاسی وەك لە ئەرکەکانی دەردەکەوێت ڕۆڵێکی بەرچاو و کارا دەگێڕێت لە کایە جۆر بە جۆرەکانی کۆمەڵگە بەگشتیی و پێکهێنانی بونیادی سیاسی بەتایبەتی، بوونی ڕۆشنبیریی سیاسی لە ئاستێکی بەرز لە هەر کۆمەڵگەیەکدا کەشێکی دیموکرات، دەخولقێنێت، واتە پێوەندییەکی پتەو و بەهێز هەیە لە نێوان ڕۆشنبیریی سیاسی و بەدیهێنانی دیموکراتی لەناو کۆمەڵگەکاندا و کاریگەریی دەبێت لە بەرزکردنەوەی پلەی بەشداری سیاسی هاوولاتییان.

### (١-٢-٥) پێکهاتەکانی ڕۆشنبیریی سیاسی:

دەکرێ لێرەدا قسە لەسەر کۆمەڵێك ڕەگەز و بنەمای پێکهێنەری ڕۆشنبیریی سیاسی بکەین، جا ئەم بنەمایانە ئەوانە بن کە دەوڵەت پێڕەویان دەکات و داوایان دەکات (ڕۆشنبیریی فەرمانڕەوایان) یان ڕۆشنبیریی فەرمی و ئەوانە بن کە لەلای تاکەکانی کۆمەڵگە هەیە. ئەمانەی خوارەوە پێکهاتەکانی ڕۆشنبیریی سیاسین.

**١- سەرچاوە:** چوارچێوەی هزری فەلسەفی خەملیوو یاخۆ سەرچاوەی سەرەکیی بۆ کاری سیاسی، چونکە ئەم پێکهێنەرە مێژوو شرۆڤە دەکات و ئامانج و تێڕوانینەکان دیار دەکات، هەروەها پاساو بۆ هەڵوێست و ڕەفتارەکان دێنێتەوە، لەهەمانکاتدا ڕەوایەتی دەبەخشێتە سیستەمەکە.

---

(٢٥) عبداللة محمد عبدالرحمن، مصدر السابق، ص٤٤٠ - ٤٤٣ .

**٢ـ ئاراسته بەرەو كاری گشتیی:** لێرەدا جیاوازییەك هەیـە لـە نێـوان ئاراستەی تاك كـە ئـارەزوو دەكـات بـۆ بەرزبوونـەوەی پلـە و پایـەی تـاك و زاڵكردنـی بەرژەوەنـدی تاكـە كەسـی، لەگـەڵ ئاراسـتە و مـەیلی گشـتیی و كۆمەڵكاری كە واتای باوەڕبوون بەگرینگی كاری هاوبەش لـە هـەردوو بـواری كۆمەڵایـەتی و سیاسـییدا، ڕووكردنـە كـاری گشـتیی و هەسـتكردن بـە بەرپرسـیارێتی كۆمەڵایـەتی بەرامبـەر كێشـەكانی كۆمەڵگـە یەكێكـە لـە گرینگترین پێكهاتەكانی ڕۆشنبیریی سیاسییدا، لەبەرئـەوەی ئـەم هەسـتكردن بە بەرپرسیارێتییە پـاڵ بەهاووڵاتیـەوە دەنێـت بـەرەو سـەوداكردنی ئـەرێنی لەگەڵ كێشە و بابەتەكاندا لەژێرسایە و سێبەری ڕۆشنبیرییدا [٢٦].

**٣ــ ئاراسـته بـەرەو سیسـتەمی سیاسـی:** ڕووكردنـە سیسـتەمی سیاسـی و باوەڕبوون بە پێویستیی لایـەنگری بـۆی و هۆگربـوونی پێیـەوەی لـە پێویسـتییەكانی هەستكردنە بەهاونیشتمانی بوون و ئەو ماف و ئەركانەی كە لێی دەكەونەوە، چـونكە هەر ڕۆشنبیرییەكی سیاسی پێویستە بازنەیەكی گشتیی دیار بكات بۆ كاری سیاسـی و سنووری ڕەوایی لە نێوان ژیانی گشتیی و ژیانی تایبەتی دەستنیشان بكات.

هـەروەها ڕۆشـنبیریی سیاسـی زانینـی سـنووری بەشـداریكردن لـەو سیسـتەمەدا دەسەپێنێت وەك پێگەی كۆمەڵایەتی و باری خێزانی و ڕەگەز و تەمەن. جگە لەمانە هەندێك ڕۆشنبیریی سیاسی سورە لەسەر دیاركردنی كاری سیاسی لەدەوڵەت و پۆستە سیاسییەكان و ئەو میكانیزمانەش دیار دەكات بۆ چەسپاندنی ئامانجەكانی دەوڵەت،

---

(٢٦) وەرگیراوە لە:" الشبكة النبأ المعلوماتية "(الثقافة السياسية) منشور علی الموقع التالي، http://ar.wikipedia www.googl.com ٢٠٠٩/١٢/٢١. كنێر عەبدوڵا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٩-٥٠.

لەبەرئەوەی ئەوە ڕۆشنبیریی سیاسییە کـە پشـتگیری سیسـتەم دەکـات و سـنوور و چوارچێوەکانی دیار دەکات و ئەو زانیاریانەی پێ دەبەخشێت کە لە کەتواری ژینگە و تایبەتمەندییەوە بەرهەم دێن و مانەوەی مسۆگەر دەکەن و دەیپارێزن.

**١. هەستکردن بە شوناس:** هەندێك پێیان وایە هەستکردن بە لایەنگری یەکێکە لە گرینگترین بیروباوەڕی سیاسی، ئەمەش هەستی تاکە بۆ لایـەنگری سیسـتەمی سیاسی کە یارمەتی دەدات بۆ ڕەوایەتیدان بـەم سیسـتەمە هـەروەك یارمەتیشـی دەدات بۆ مانەوەی و پلانداڕان بۆی لە کـاتی ڕووبەڕووبونـەوەی تەنگـژەکان، لـە هەمانکاتدا هەستکردن بەلایەنگری بۆ نیشـتمان یارمـەتی دەرە بـۆ گەشـەکردنی هەستکردن بەئـەرکی نیشـتمانی و قبـوولکردنی پابەندییـەکان، هـەر وەك چـۆن یاریـدەدەرە بـۆ تێگەیشـتن لـە مـاف و بەشـداریکردنی چـالاکانە لـە پرۆسـە سیاسـییەکاندا لەمیانـەی هاوکـاری دامودەزگـە حکومییـەکان و دامـەزراوە سیاسییەکان و قبوولکردنی بڕیارەکانی دەسەلاتی سیاسـی و بـاوەڕبوون بـە ڕۆڵـی چالاکانەیان لەگشت بوارەکاندا [٢٧].

---

(٢٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## (٦-٢-١) پێوەندیی چەمکی ڕۆشنبیریی سیاسی

## بە چەند زاراوەیەکی دیکەی هاوشێوەی

لە زانستی سیاسەتدا هەندێك لە چەمك و زاراوەکان تاڕادەیەك لێکچوونێك هەیە لەنێوانیاندا و لە یەك نێزیك دەبنەوە لەو واتایەکی کە هەڵیان گرتووە، لەو ئامانجەی کە کاری بۆ دەکەن، لێرەدا هەوڵ دەدەین لەپاڵ چەمکی ڕۆشنبیریی سیاسییدا تیشکێك بخەینە سەر چەند چەمکێکی دیکەی وەکو هۆشیاری سیاسی و گەشە و پەرەسەندنی سیاسی و ڕۆشنبیریی سیاسی حزبی و پێگەیاندنی سیاسی و بەشداریکردنی سیاسی، هەروەك لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێکرد ڕۆشنبیریی سیاسی بریتییە لە کۆمەڵێ ئاراستە و بیر و باوەڕ و هەست، کە واتای سیستەم دەبەخشێتە پرۆسەی سیاسی، هەروەها بنەما جێگیرەکان دەبەخشێتە حوکم (سیستەمی حوکمڕانی) بۆ کارکردنی تاك لەناو سیستەمی سیاسی.

هەروەها ڕۆشنبیریی سیاسی گوزارشتە لە بیرو باوەڕ و جەڤەنگ و بەهای دیارکراو بۆ ئەوەی کۆمەڵگە ڕۆڵی گونجاو ببینێت لە حکوومەت و پرۆسەی سیاسییدا.

لەبارەی هۆشیارییەوە کە پێناسەکراوە بەم شێوە گوزارشتی لێکراوە (هۆشیاری بریتییە لە فۆرم گرتنی ئەو هزر و بیروبۆچوون و تێگەیشتنەی مرۆڤ، سەبارەت بەژیانی دەوروبەری لە ئاستە جیاوازەکان دا) [٢٨].

---

(٢٨) وەگیراوە لە : چنار سەعد عەبدڵا، کاریگەری باری سیاسیی لەسەر گەشەکردنی هۆشیاری نەتەوەی کورد دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١، چاپی یەکەم، بەڕێوبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٥ز، ل ١٨ .

هۆشیاری سیاسی بریتییە لە (کۆی گشتیی ئەو کردارە ئەقڵییانەی کە بە شێوەیەکی ئەرێنییانە بەشداری دەکات لە تێگەشتنی مرۆڤ بۆ جیهانی کەتواری، هەروەها تێگەیشتن لە بوونی تایبەتی خۆی و ئەو تێڕوانین و بەرچاوڕوونییەی کە هەیەتی بۆ پرۆسەی سیاسی و بوارە جۆربەجۆرەکان لە ژیانی سیاسییدا) [٢٩].

چەمکی گەشە و پەرەسەندنی سیاسی یەکێکی دیکە لەو چەمکانەی کە دەمانەوێت ئاماژەیەکی پێ بدەین، چونکە زاراوەیەکی گرینگە لە بواری زانستی سیاسییدا، کە بەم شێوەیە پێناسەکراوە: (پەرەسەندنی سیاسی پرۆسەیەکی گەشەکارییە لەڕێی ناوەندگەلی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەمەجۆرەوە کە لە ڕێگەیەوە تاك دەتوانێت زانیاریی لێوەر بگرێ و هەڵوێستی ئەوتۆی لا چێ بکات، کە لە کەسەکان و دامەزراوەکان و هەموو شتەکانی دیکەش تێ بگات، کە لە ژینگە سیاسییەکەدا هەیە) [٣٠].

لە لایەکی دیکەوە "شینکۆف **Sheinkoof**" واتایەکی گشتگیرتر دەداتە زاراوەی پەرەسەندنی سیاسی و دەڵێ: (پەرەسەندنی سیاسی پرۆسەی گواستنەوەی ڕفتار و نەریتی سیاسییە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە).

هەر لە چوارچێوەی بابەتەکەدا لە جێگەی خۆیدایەتی کە ئاماژە بە چەمکی ڕۆشنبیریی سیاسی حزبی بکەین، کە ڕۆشنبیریی حزبایەتی تەنیا ڕۆشنبیریی گشتیی ناگەیەنێ بگرە ڕۆشنبیریی حزبایەتی (بریتییە لە کرداری تێگەیشتن و بیناکردنەوەی هزر و ڕەوشت و هەڵسوکەوتی ئەندام و کادیران کە ئۆرگانەکان هەر یەکە لە ئاستی خۆی ئەنجامی دەدات، هەموو ڕێکخراوێکی سیاسی پێویستە بەردەوام بێت لەکاردا

---

(٢٩) هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

(٣٠) د.محەمەد بن سعوود ئەلبەشر، سەرەتایەك لە پێوەندیکردنی سیاسیی، و: مەم بورهان قانع، چاپی یەکەم، چاپخانەی بینیای، ٢٠٠٧ز، ل ١٤٠.

بۆ مسۆگەرکردن و بەدیهێنانی ئاستێکی بەرزی ڕۆشنبیریی لە هەموو بوارەکان بۆ ئەندامانی) [٣١].

لە لایەکی دیکەوە لەپاڵ ئەو چەمك و زاراوانەی کە باسمان لێوەکردن ئاماژەیەکیش بە چەمکی پێگەیاندنی سیاسی دەکەین: (کە ئەو پرۆسەیە دەگرێتەوە کە تاك بە هۆیەوە زانیاریی و ڕاستی و بەها و وێنە سیاسییەکانی تێدیە دەست دەهێنێت، بە هۆی ئەمەشەوە هەڵوێست و ئاراستە هزری و ئایدیۆلۆژییەکانی دێنێتەدی، کە کاریگەریی دەبێ لەسەر ڕەفتار و کاری ڕۆژانە، هەروەها پلەی پێگەیشتوویی و چالاکییە سیاسییەکانی لەناو کۆمەڵگەدا دیار دەکات) [٣٢].

بەشداری سیاسیش وەکو یەکێکی دیکە لە چەمکە بەرچاو و کاریگەرەکان لەناو زانستی سیاسەتدا زۆر قسە و باسی لەسەر دەکرێت و بەکاردەهێنرێت. بەشداری سیاسی کۆمەڵێك چالاکی خۆویستانەیە، کە بەهۆیەوە ئەندامانی کۆمەڵگەیەك لە دانانی فەرمانڕەواکان، هەروەها بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ پشکداری لە شکڵگیری سیاسەتی گشتییدا دەکەن. بەشداری سیاسی لای تاکەکان بەشدارییەکی ئازادانەیە و لە پرۆسەیەکی ئاواد دا تاك خاوەنی ویستیەکی ئازادە .

هەریەکە لە "سامویل هانتنگتۆن و نیلسۆن" بەم شێوەیە پێناسەی بەشداری سیاسی دەکەن: (بەشداری سیاسی ئەو چالاکییەیە کەوا کۆمەڵێك هاووڵاتی دیارکراو بە مەبەستی کاریگەری دانان لەسەر پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری حوکمیدا) [٣٣].

---

(٣١) محەمەد فاتیح، ڕۆشنبیری و ڕۆشنبیری حزبایەتی، بەشی ڕووناکبیری (١٠٩) مەکتەبی ڕێکخستن ، سلێمانی ، ٢٠٠٥ز، ل ١٧.

(٣٢) عوسمان عەلی حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٢.

(٣٣) ڕابەر تەلعەت، گەنج و بەشداری سیاسی، چاپی یەکەم، دەزگای تۆژینەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٦ز، ل ٦١.

لەلایەکی دیکەوە بەشداری سیاسی (بریتییە لەو چالاکییەی کە هاوولاتیانی ئاسایی ئەنجامی دەدەن، بە مەبەستی کارکردنە سەر پرۆسەی دروستکردنی بڕیارە حکومییەکان و جێبەجێ کردنیان. جا ئەو چالاکییە تاکەکەسی بێت یان دەستە جەمعی، ڕێکخراوەیی بێت یان هەڕەمەکی، بەردەوام بێت یان پچڕ پچڕ، ئاشتیانە بێت یان توندوتیژ ئامێز بێت یان نارەوا، کارا بێت یان ناکارا) [٣٤].

ئەم چەمك و زاراوانەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا و شرۆڤەمان کرد، ئەو چەمك و زاراوانە بوون کە لە زانستی سیاسەتدا ڕۆڵێکی بەرچاو و ڕۆڵێکی کاریگەرییان هەیە بەسەر پرۆسەی سیاسەوە بەگشتی. کە ئاستی پێشکەوتنی کۆی سیستەم و پرۆسەی سیاسی لە ولاتدا نیشان دەدەن، هەموو ئەم چەمکانە پێکەوە (ڕۆشنبیریی سیاسی، هۆشیاری سیاسی، گەشە و پەرەسەندنی سیاسی، ڕۆشنبیریی سیاسی حزبی، پێگەیاندنی سیاسی، بەشداری سیاسی). پێوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ یەکدی هەیە و تەواوکەری یەکترن، هەر یەکەیان ئەویدی تەواو دەکات، کە پێکەوە لە دەوری ئەو ئامانجە دەخولێنەوە، کە هەوڵدانە بۆ فەراهەمکردنی پرۆسەیەکی سیاسی تێروتەسەل و تەواو کە سەرەنجامی ئەم پرۆسە تەواوەش دەمانگەیەنێ بە بەرقەراربوونی کۆمەڵگەیەکی تەندروست، کە تیایدا پرۆسەی بەدیموکراتیزەبوون دەگاتە ئاستێکی بەرز و بەرچاو.

کەواتە هەبوونی ڕۆشنبیری سیاسی و هۆشیاری لەلای تاکەکان لە ئاستێکی بەرزدا کۆمەڵگە ڕۆشنبیر و هۆشیار دەکات لە هەموو ئەو کار و جموجۆلانەی کە لە پرۆسەی سیاسیدا ڕوو دەدات، کە ئەمەش وا دەکات پێوەرەکانی سیستەمێکی دیموکراتی لە کۆمەڵگەدا سەر هەڵبدات و کۆمەڵگە بەرەو قۆناخی بەدیموکراتیزەبوون ببات.

---

(٣٤) عابد خالید ڕەسوڵ، ڕۆڵی حکوومەت لە بەشداریکردنی سیاسیدا، گۆڤاری ڕۆشنگەری، لە بلاوکراوەکانی نێوەندی ڕۆشنگەری بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری و سیاسی، شوێن و ساڵ نەنوسراوە ژمارە (٢٥)، ل ١٣٩.

# بەشی دووەم: ڕۆشنبیریی سیاسی و دیموکراتی

## (٢ـ١) ڕۆشنبیریی سیاسی و سیستەمی سیاسی

### (٢ـ١ـ١) کاریگەری و پێوەندی نێوان ڕۆشنبیریی سیاسی و شێوازی سیستەمی سیاسی

دیارە ڕۆشنبیریی سیاسی لای هەر تاکێك و لەناو هەر کۆمەڵگەیەکدا پێوەندییەکی پتەوی بە شێوازی سیستەمی سیاسی ئەو دەوڵەتەوە هەیە و کاریگەرییەکانی خۆیشی لەسەر دادەنێت. بۆیە پێویستە تێڕوانینی گشتگیرانەی سیستەمی سیاسی، ژینگە کولتووریەکەی خۆی لە بەرچاو بگرێت کە کار دەکاتە سەر کارکردی سیستەمەکە، چونکە بەشێك لە ڕەفتاری تاکەکان لەناو دەزگە سیاسییەکاندا بە پێی کولتووری سیاسی دیار دەکرێن، کە بەها و ڕەوتە سیاسییەکانی پێ ئاراستە دەکرێن. لەلایەکی دیکەوە داواکاری فەرمانڕەوایکراوەکان لە سیستەمی سیاسی و شێوازەکانی گوزارشتکردن لەو داواکارییانە لەژێر کاریگەری کولتووری سیاسی باودایە. بەم جۆرە گۆڕانکاریی سیاسی پێوەندییەکی توندوتۆڵی بە ڕۆشنبیریی سیاسییەوە هەیە، هەردەم ڕۆشنبیریی پاڵنەرێك دەبێت لەسەر ڕێگەی گۆڕان یان بە پێچەوانەوە[٣٥].

کەواتە هەموو سیستەمێکی سیاسی بۆ ئەوەی توانای بەردەوامبوون و جێگیربوونی هەبێت، هەوڵ دەدات لە ڕێگەی پەروەردەی سیاسییەوە، بەها و نۆرمەکانی خۆی

---

(٣٥) د. کەمال مەنوفی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٦.

لەناخی تاکەکاندا بچێنێت، لێرەشەوە کارێك بکات، کە خۆیان خۆبەخۆو بەویستی خۆیان بەپێی ئەو سنوور و یاسایانە ڕەفتاربکەن کە سیستەمەکە دیاریکردووە. بۆیە هەر سیستەمێکی سیاسی پێویستیی بە ڕۆشنبیریی سیاسی هەیە بۆ ئەوەی هاوکار و یارمەتیدەر بێت و پارێزگاری لێ بکات، بەو پێیەی پێوەندییەکی پتەو پێکیانەوە دەبەستێتەوە، ئەم ڕۆشنبیرییە لە سیستەمێکەوە بۆ سیستەمێکی دی جیاوازە، بەجۆرێك کە لەو سیستەمە سیاسییانەی تاکڕەوییە و دەسەڵاتی تاك تیایدا باڵادەستە ڕۆشنبیرییەکی سیاسی ئەوتۆ لەگەڵی دا گونجاوە کە ڕەهەندەکانی بریتین لە ترس لە دەسەڵات و ملکەچبوون بۆ دەسەڵات و لاوازی مەیلی بەشداریکردن و کەم بڕوای بەشکۆمەندی و خودێتی مرۆڤ و ڕێگە نەدان بە ڕەخساندنی دەرفەت بۆ دەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆن [٣٦]، چونکە ئەو سیستەمەی کە تێیدا پرۆسەی بڕیاردان لە لووتکەی هەرەمی سیاسیدا قۆرخ دەبێت، کەشوهەوای ئازادی لێ بزر دەبێت و هیچ جۆرە نەنگییەك نابینن لە بەکارهێنانی ترس و تۆقاندن دژی ژێر دەستەکانی خۆیان، بۆیە ئەم جۆرە سیستەمە بەشداری دەکات لە بەرهەمهێنانی کولتوورێکی سیاسییدا کە پێکهێنەرەکانی لە دەوری ڕقلێبوونەوەی دەسەڵات و ترسان لێی و بایەخ نەدان بە هەموو شتێکی سیاسی و بزریی گیانی دەستپێشخەری و بڵاوبوونەوەی مەیلی تاکایەتی دەسوڕێتەوە، کەواتە لەم جۆرە سیستەمانەدا ڕۆشنبیریی سیاسی لە چوارچێوەیەکی بەرتەسك دایە و تاکەکان لە فەراهەمکردن و بەدەستهێنانی ڕۆشنبیریی دا دەستەوسانن بە هۆی ئەو بارودۆخەوە کە سیستەمی سیاسی خوڵقاندویەتی و داخراوی دامەزراوەکانی جۆربەجۆر بەڕووی هاووڵاتییان تیایدا، بەڵام بە پێچەوانەوە لە سیستەمی سیاسی دیموکراتی ڕۆشنبیرییە سیاسییەکەی وا دەخوازێت کە باوەڕی بە مافەکانی مرۆڤ هەبێ،بڕوای تەواوی هەیە بە پێویستیی پارێزگاریکردنی تاکەکان و ڕێزگرتنی شکۆمەندی مرۆڤەکان لە کاتی هەر

---

(٣٦) کنێر عەبدوڵا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١.

پێشێلکردن و دەستدرێژیکردنێك بۆ سەر ئازادییەکانیان، هەتا ئەگەر هاتوو ئەم دەستدرێژیکردنانە لەلایەن خودی دەسەڵاتیشەوە بێت، هەروەها ڕۆشنبیریی سیاسی لەم جۆرە سیستەمە سیاسییەدا پێی وایە کە بۆ بەردەوامبوون و پاراستن و مانەوەی سیستەمە سیاسییەکە پێویستە برەو بدرێت بەهەستی متمانەکردنی دوولایەنە و باوەڕبوون بە هاووڵاتیان لەژێر کەشوهەوای کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی، چونکە ئەمە وا دەکات کە مرۆڤەکان بیرۆکە و ڕای بەرامبەری قبوولّ بکات و ڕێگە دەدات بە بوونی جۆرێك لە ئۆپۆزسیۆن لە چوارچێوەی بنەمای سیاسی کە وردەکارانە دانراوە بۆ ڕێکخستنی پێوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەی سیاسی (٣٧).

بۆیە دەبینین کە ڕۆشنبیریی سیاسی کاریگەریی بەرچاوی هەیە لەسەر سیستەمی سیاسی تاڕادەیەکی زۆر، لە گەلێك وڵاتیشدا ڕۆشنبیریی سیاسی بەشداری دەکات لە دیارکردنی شێوەی سیستەمی حوکمڕانی، بگرە لەگەڵ ئەوەشدا دەشێت بەشداری بکات لە دیارکردنی ڕەگەزەکانی سیستەمی حوکمڕانی، سەرباری ئەو کاریگەرییەی کە ڕۆشنبیریی سیاسی هەیەتی لەسەر سیستەمی سیاسی، پێوەندیی نێوان ڕۆشنبیریی سیاسی و شێوازی سیستەمی سیاسی پێوەندییەکی زۆر پتەو و بەهێزە بە جۆرێك کە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی ڕۆشنبیریی سیاسی لەگەڵ جۆرێك بونیادی سیاسی یەکدەگرێتەوە، بەشێوەیەك کەوا ڕۆشنبیریی سیاسی سەرەتایی (ناوچەیی ـ کۆن) بەرامبەر بونیادێکی کۆمەڵایەتی کلاسیکی نامەرکەزی و ڕۆشنبیریی سیاسی ملکەچ گەرایی لەگەڵ بونیادێکی دەسەڵات پاوانخوازی و هەروەها ڕۆشنبیریی سیاسی بەشداریکردن دەهەمبەر بونیادێکی سیاسی دیموکراتی یەکدەگرێتەوە (٣٨).

لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت گۆڕانکاریی لە سیستەمی فەرمانڕەوایدا ببێتە هۆی ڕوودانی هەندێك گۆڕانکاریی لە ناوەڕۆکی کولتووری سیاسییدا، بۆ نموونە کاتێك کۆمەڵگە

---

(٣٧) الشبكة النبأ المعلوماتية "الثقافة السياسية"، مصدر السابق.

(٣٨) عوسمان عەلی حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٩-٩٠.

خۆرئاواییەکان سیستەمی دیموکراتیان پەسەند کرد خاوەنی کولتووری دیموکراتی نەبوون، بەڵام بەشداریکردنێکی دیموکراتییانە بووە هۆی خوڵقاندنی کۆمەڵێك بەها و ئاراستە و هەست و سۆزی گونجاو بۆ سیاسەتی دیموکراتی [٣٩].

هاورێکی لە نێوان جۆری ڕۆشنبیریی و جۆری بونیادەکە ئارامی سیستەمی سیاسی بەرقەرار دەکات، ئەگەر ئەم دوو توخمە (ڕۆشنبیریی سیاسی لە لایەك و سیستەمی سیاسی لە لایەکی دیکەوە) لەناو هەر سیستەمێکدا کۆك نەبوون ئەوا کەلێنێ لە نێوان بونیادی سیستەمی سیاسی و ڕۆشنبیریی سیاسی دروست دەبێت و هەڕەشە لەسەر کاری ئەو سیستەمە دروست دەکات، بۆیە دەکرێت بگوترێت جێگیربوونی سیاسی پشت بە ڕۆشنبیریی سیاسی دەبەستێت چونکە تەبایی و ڕۆشنبیریی و کۆکبوونی ڕۆشنبیریی دەستەبژێر و حاکمەکان و جەماوەر یارمەتیدەرن بۆ جێگیربوونی سیاسی، بەپێچەوانەشەوە پارچەپارچەبوونی ڕۆشنبیریی و جیاوازی نێوان ڕۆشنبیریی جەماوەر و ڕۆشنبیریی دەستەبژێر و حاکمەکان سەرچاوەی هەڕەشەکردنە بۆ جێگیربوونی سیستەمی سیاسی، بۆیە دەبینین پێوەندییەکی پتەو هەیە لە نێوان ڕۆشنبیریی سیاسی شێوازی سیستەمی سیاسی و بەشێوەیەکی توندوتۆڵ پێکەوە گرێدراون.

## (٢.١.٢) کاریگەری ڕۆشنبیریی سیاسی لە بەدیهێنانی دیموکراتی:

مەبەست لە ڕۆشنبیریی سیاسی ئەو بیروبۆچوون و زانیاری و ئاراستە باوانەیە کە بەرامبەر کاروباری سیاسی و حوکمڕانی، دەوڵەت و دەسەڵات، ڕەوایەتی و بەشداریکردن لەلای تاکەس لە کۆمەڵگەیەکدا هەیە، ئاست و چۆنییەتی

(٣٩) د.کەمال مەنوفی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٦.

ڕۆشنبیری سیاسیی لای تاکەکەس پێوەندیی بە شێوازی پەروەردەکردنی سیاسییەوە هەیە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا. پەروەردەی سیاسیش بریتییە لەو پرۆسەیەی کە لە ڕێگەیەوە تاکەکەس زانیاری، بەها، ئایدیا و فاکتە سیاسییەکان وەردەگرێت. لەم چوارچێوەیەشدا، هەڵوێست، ئایدیۆلۆجیا، شێوازی بەشداریکردنی لە پرۆسەی سیاسی و ساتوسەودای و ڕەفتاری ڕۆژانەی خۆی لەگەڵ ڕووداوە سیاسییەکاندا دیاری دەکات و ڕادەی بەشداری و کاریگەربوونی لە پرۆسەی سیاسیدا دەستنیشان دەکات[٤٠].

بڵاوبوونەوەی هۆشیاری و ڕۆشنبیریی سیاسی لەسەر ئاستی تاکەکەس و لەکۆمەڵگەدا، ڕێگەخۆش دەکات بۆ ئەوەی زانیاری ڕاستەقینە سەبارەت بە ڕۆڵی تاکەکەس لە سیستەمی دیموکراتیدا، هەنگاو بەهەنگاو لەناو دامودەزگە ڕەسمییەکانی دەوڵەت و خانە کۆمەڵایەتییەکاندا جێگەی خۆی بکاتەوە. هەر لە سیستەمی خوێندن و سیستەمی سیاسییەوە، تا دەگاتە خێزان و ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییەکان.

بەکورتی زانیاری و بەها و نۆرمە سیاسییەکان دەبنە بەشێك لە کولتووری کۆمەڵگە. بەم پێیەش کولتووری فرەیی و قبووڵکردنی ڕەنگ و دەنگی جیاواز، تێگەیشتن لەوەی هیچ کەس و لایەنێك خاوەنی ڕاستی ڕەها نییە و کەتواری کۆمەڵایەتی و سیاسی زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە تەنیا لەچوارچێوەی یەك لێکدانەوەدا سنووردار بکرێ، بگرە دەشێت لێکدانەوە و شیکردنەوەی جیاواز بۆ هەر دیاردە و ڕووداو و پێشهاتێك هەبێت، بەم شێوەیە بەشداریکردنی ئەندامانی کۆمەڵگە لە بڕیارو بەڕێوەبردنی وڵاتدا و دەستاودەستکردنی دەسەڵات بەشێوەیەکی ئاشتیانە و لە ڕێگەی سندووقەکانی دەنگدانەوە، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و مافی چاودێریکردنیان لەلایەن هاووڵاتیانەوە، حوکمی زۆرینە و

---

(٤٠) کنێر عەبدوڵا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٧.

پاراستنی مافی کەمینە دەبێتە بەشێکی ئۆرگانیی کەلتووری کۆمەڵگە و تاکەکەسەکان ئامادە نابن لە هیچ بارودۆخێکدا دەستیان لێ هەڵگرن.

بەم شێوەیە، ئەگەرچی هەمیشە زۆرینەی هاووڵاتیانی کۆمەڵگەیەك، ئەوانەن کە لە دەرەوەی کایەی سیاسین، واتە بە پیشە سیاسەتمەدار یان چالاکڤانی ناو کایەی سیاسی نین، بەڵام بەهۆی هۆشیاری سیاسییانەوە، هەرکاتێك بەشدارییان لە پرۆسەی سیاسیدا کرد (بۆ نموونە لەکاتی هەڵبژاردن و دەنگدان و ڕیفراندۆمەکاندا)، بەو پێیە ڕەفتار دەکەن، کە دەبێ لە سیستەمێکی سیاسیدا ڕەفتاربکەن و کاریگەرییان هەبێ. لە بەرامبەردا تاچەند دەسەڵاتی سیاسی یان حکوومەت دابین کردنی پێداویستی و ئەو ئامانجانە سیاسیانەی کە خولیای جەماوەرە، ئەو جەماوەرەی کە خاوەن ڕۆشنبیرییەکی سیاسییە دەتوانێ دەسەڵات هان بدات بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانیان لە میانەی بەشدارییەکی کارا و چالاکی جۆراوجۆرو، بە پێچەوانەی ئەو جەماوەرەی کە خاوەن بەشدارییەکی کلاسیکی بەرتەسکە [٤١].

لاوازی ئەم بەشداریکردنەش بۆ نزمی ئاستی هۆشیاری و ڕۆشنبیری سیاسی دەگەڕێتەوە لای ئەو جەماوەرە بەرامبەر بە بونیادە سیاسییەکانی کۆمەڵگە، لە هەمانکاتدا یەکێك لە ئەرکەکانی ڕۆشنبیریی سیاسی بریتییە لە لێکۆڵینەوەلەبارەی پرۆسەی بەشداری سیاسی و چۆنییەتی بەردەوامی و نوێکردنەوەی، ڕۆشنبیریی سیاسی ڕەگەزی هەرە سەرەکیی و بنچینەی گەشەپێدانی پرۆسەی بەشداری سیاسی و پەرەپێدانی سیاسییە، کە دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین کە پرۆسەی نوێبوونەوەی ڕۆشنبیریی سیاسی هاوکارمان دەبێت لە دروستکردنی جۆرێك لە پاڵنەرایەتی و کار و گەشەکردنی چالاکی دیموکراتی کارا لە ژیانی سیاسییدا، کە ئەمەش نایەتەدی ئەگەر لە ڕێگەی

---

(٤١) عوسمان عەلی حەسن، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٠.

ڕۆشـــنبیریی و هۆشـــیاری سیاســـی کۆمەڵـــەوە نـــەبێت[٤٢]. واتـــە ڕۆشـــنبیریی سیاســـی دەبەستێتەوە بە چالاکبوونی دیموکراتی.

هەرچی سەبارەت بەسیستەمی دیموکراتیشە، سەرچاوەکانی پەروەردەکردنی سیاسی جۆراوجۆرو فرە ڕەنگن. هەر لە خودی کایەی سیاسییەوە بگرە (کە دەنگ و ڕەنگی جیاواز و حزب و ڕێکخراوی سەر بە ئایدیۆلۆجیای جۆراوجۆری تێدایە)، تا دەگاتە کەناڵە جیاوازەکانی ڕاگەیاندن، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگـەی شارسـتانی (کـە هـەر یەکەیان بەپێی بیروبۆچوونی تایبەتی خۆیان چالاکی دەکەن و هۆشیاری سـەبارەت بە کایەی سیاسی و ماف و ئازادییەکانی تاکەکەس بڵاودەکەنەوە)، زانکۆکان (کە بەشێوەیەکی زانستی و بەدوور لە ئایدیۆلۆجیا لـە کۆمەڵگـە و ئـەرك و مـاف و ئازادییەکانی تاکەکەس، پێوەندیی فەرمانڕەوا و هاووڵاتی، سیستەمە جیاوازەکانی حوکمڕانی...هتد، دەکۆڵنـەوە و هۆشـیاری سیاسـی بڵاودەکەنـەوە)، تـا ناوەنـدە ڕۆشـنبیری و ئەدەبییـەکان و ناوەنـدەکانی چـاپ و بڵاوکردنـەوە و سـەنتەرەکانی گفتوگۆ و سیمینار و دایەلۆگ. هەموو ئەو دامودەزگە و ناوەندە جۆربەجۆرانە، لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی هۆشیاری سیاسییەوە، یارمەتی تاکەکان دەدەن تێڕوانینێکی گشتگیرتر و بابەتیتری لەسەر کۆمەڵگە و کایەی سیاسی ناو کۆمەڵگە هـەبێت و لەهەموو هەڵوێست و چالاکییەکانیدا، هۆشیارانەتر و کـاراتر بەشـداری هـەبێت، چونکە بەشداریی ڕاستەقینە، بەرهـەمی هۆشـیاریی ڕاسـتەقینەیە بەرامبـەر بـە گرینگیی ڕۆڵ و چالاکیی تاکەکەس لەکایەی سیاسیدا.

لێرەوە گرینگی ڕۆشنبیری سیاسی و ئەو ناوەندانە دەردەکەوێت، کە کار لەسـەر بڵاوکردنـەوەی هۆشـیاری و ڕۆشـنبیریی سیاسـی دەکـەن. کـە تـاچ ڕادەیـەك کاریگەرییان هەیە لە بەدیهێنانی دیموکراتی، چـونکە لـە بنەڕەتـدا دیمـوکراتی بریتییە لەو سیستەمەی دەرفەتی بەشداریکردن لە پرۆسەی سیاسیدا بۆ تاکەکەس

---

(٤٢) د. عەبدوڵا محەمەد الرحمن، مصدر السابق، ص٤٤١ .

دەخولقێنیٚ، بۆیە تەنانەت ئەگەر ڕێسا و یاسا دیموکراتییەکانیش لە وڵاتێکدا بەرقەرار و لەئارادا بن، بەبیٚ تاکەکەسی هۆشیار و ڕۆشنبیر بە پرسە جۆربەجۆرەکان ئەم پرۆسەیە پڕ لەکەموکوڕی دەبێت لەبەرئەوەی دیموکراتی ڕاستەقینە، تەنیا کاتێك دەتوانێت بوونی هەبێت، کە تاکەکەسی خاوەن ویستی ئازاد بوونی هەبێت و لە ڕێگەی ئەو باکگراوەندە ڕۆشنبیرییەی کە هەیەتی کاریگەری خۆی دابنێت، ئەمەیش تەنیا لەڕێگەی بڵاوبوونەوەی هۆشیاری و ڕۆشنبیریی سیاسی و ئازادکردنی تاکەکەس لە کۆتوبەندی پێوەندییە کۆمەڵایەتییە خێڵەکییەکانەوە بونیاد دەنرێت، بۆیە لێرەوە دەگەین بەو بەرئەنجامەی کە ڕۆشنبیریی سیاسی بە ئاستێکی بەرز لە هەر کۆمەڵگەیەکدا و لە لای هەر تاکێك، کاریگەری دەبێت لە فەراهەمکردنی بنەماکانی دیموکراتی.

## (٢.٢) کەناڵەکانی بەدیهێنانی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی دیموکراتی دا.

بەدیهێنانی ڕۆشنبیریی سیاسی لەناو کۆمەڵگەدا و لە ژیانی سیاسی و کاروباری گشتیی دا، بە ڕێگەی چەندین کەناڵی جۆراوجۆرەوە فەراهەم دەبێت، لە هەمانکاتدا زۆری و هەمەلایەنی ئەو کەناڵانەش بایەخێکی زۆری هەیە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی سیاسی لەلای تاکەکانی کۆمەڵگە سەبارەت بە بونیادی سیاسی و پرۆسەی ڕۆشنبیریی سیاسی و پرسە جۆر بە جۆرەکانی دیکە.

لێرەدا هەوڵدەدەین باس لە (پارتە سیاسییەکان، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی، دەزگەکانی ڕاگەیاندن، چەند کەناڵێکی دیکەی وەك خێزان و قوتابخانە و...هتد) بکەین، بەو پێیەی کە ئەم کەناڵانە زیاتر لە هەر ڕێگە و دامەزراوەیەکی دیکە کار و چالاکی ئەنجام دەدەن.

ئەم ڕێگە و کەناڵانە دیارترین ئامرازەکانی پەرەپێدانی ڕۆشنبیرین، کە بێگومان سیستەمە کولتوورییەکان، تاڕادەیەکی زۆر سەرکەوتووبوون لە گۆڕینی بەرنامەڕێژی چوارچێوە کولتوورییەکان. بۆیە فەراهەمکردن و بەدیهێنانی ڕۆشنبیریی سیاسی لەڕێگەی چەند دامەزراوەیەکەوە دێتەدی کەوا لە خوارەوە ئاماژە بە گرینگترینیان دەدەین.

### (١.٢.٢) پارتە سیاسییەکان Political Partie:

بێگومان حزب یەکێکە لە پێداویستییەکانی سیستەمێکی دیموکراتی و بەیەکێك لە دەزگەکانی دیموکراتی ناوزەد دەکرێ، بوونی فرە حزبی یەکێکە لە خەسڵەتە دیارەکانی هەر سیستەمێکی دیموکراتی، پارتە سیاسییەکان چەند

ڕێکخراوێکی سیاسین و لە کایەی گشتیی و جۆربەجۆردا کاردەکەن و دەیانەوێت دەسەلاّت وەربگرن، لە زۆرینەی ولاّتەکان دا پارتە سیاسییەکان ڕۆڵێکی گرینگ لە پرۆسێسی دیموکراتیدا دەگێڕن، لە ڕێگەی ئەو کار و چالاکییانەی کە ئەنجامی دەدەن و دەبنە پردی پێوەندی کە هاوولاّتییان و حکوومەت بە یەکتری دە گەیەنن و ئەو ڕێگە و شێوازانەش دابین دەکەن بۆ ئەم مەبەستە [٤٣]، لەگەلّ ئەوەشدا زۆرینەی پارتە سیاسییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە پرەنسیپە دیموکراتییەکان دەپارێزن و پراکتیزەی دەکەن، واتە حزبە سیاسییەکان بنەماکانی سیستەمێکی دیموکراتی پێك دەهێنن.

حزب وەك ڕێکخراوێکی سیاسی و کۆمەلاّیەتی ڕۆڵێکی گرینگ دەبینێت لە درووستکردنی پێوەندی لە نێوان دەسەلاّت و هاوولاّتییان بەتایبەتی ئەو خەلّکانەی کە خوازیاری بەشداریکردنن لە سیاسەتدا، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەر کاتێك ڕۆشنبیریی سیاسی لە ئاستێکی بەرزدا بێت لای تاکەکانی کۆمەلّگە، نێزیکبوونەوەی تاکەکان لە دەسەلاّت و ناوەندەکانی بڕیار زیاتر دەبێت و تاك هەست دەکات بەکاریگەرییەکانی خۆی لەنێو سیاسەتی گشتییدا.

بۆیە لە چوارچێوەی کۆمەلّگە نوێیەکانی هاوچەرخ و دەولّەتانی پێشکەوتودا حزبە سیاسییەکان توخمی گرینگ و ناوەندین لە پرۆسەی دیموکراتیەتدا، لە بەرئەوەی حزب وەك پرۆفیسۆری زانستە سیاسییەکان و یاسای دەستووری فەرەنسی "جۆرج بیردۆ" دەلّێت: (ئەو ئامرازەیە کە جێگرەوەی نییە بۆتاك بۆ ئەوەی بتوانێت کاریگەری هەبێت لەسەر بەڕێوەبردنی کار و باری گشتیی) [٤٤].

---

(٤٣) کۆمەلّێك نووسەر، زانستی سیاسیی، وتاوات ئەحمەد، چاپخانەی ڕەنج، چاپی یەکەم، سلێمانی، سالّی ٢٠٠٦، ل ٨١ .

(٤٤) سەعید مەموزینی، سیاسەت گەمەیەکی بەردەوام، چاپخانەی منارە، چاپی یەکەم، هەولێر، سالّی ٢٠١٠ ، ل ١٣٤ .

بەم شێوەیە حزبە سیاسییەکان ئامرازێکە کە هاووڵاتییان لە میانەیەوە کار و چالاکی و کاریگەرییەکانی خۆیان ئاراستە دەکەن بەرامبەر بە سیستەمی سیاسی.

لێرەدا پێش ئەوەی کە باسی ڕۆڵی پارتە سیاسییەکان بکەین وەك ئامرازێك بۆ فەراهەمکردنی ڕۆشنبیریی سیاسی تیشکێکی کورت دەخەینە سەر چەمکی پارتە سیاسییەکان و مێژووی سەرهەڵدانی پارتە سیاسییەکان، دیارە سەبارەت بە چەمکی پارتە سیاسییەکان پێناسەی هەمە جۆری بۆکراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەنێو پێناسە جۆربەجۆرەکاندا خاڵی هاوبەش هەیە، هەرچەندە کەوا چونیەك نین، لەگەڵ ئەوەشدا بەم شێوەیە گوزارشتیان لێکردووە (حزب دەستە و گرووپ و ڕێکخراوێکی سیاسییە کە هاوبیران و لایەنگرانی ئایدیایەك بە پێی ویستی خۆیان کۆدەبنەوە پرۆگرام و پێڕەوی ناوەخۆی هەیە لەگەڵ سەرکردایەتی و ڕێبازی تایبەتی خۆی و لە کۆمەڵە مرۆڤێکی هاوئامانج پێك دێت کە لەژێر ئاڵاکەی کۆبوونەتەوە (٤٥).

هەروەها "مۆریس دوڤرجیە" پرۆفیسۆری فەرەنسی لەمەڕ حزبە سیاسییەکان دەڵێت (کۆمەڵە خەڵکێکی یەکگرتوون لەسەر بنچینەی سیستەمێك) (٤٦).

کەواتە پارتە سیاسییەکان گوزارشتن لەکۆبوونەوەی ژمارەیەك هاووڵاتییان لەڕێکخستنێکی دیاری کراودا کە دەیەوێت بەرگری لە بەرژەوەندی و سەرکەوتنی بیرۆکەکانیان بکان و گفتوگۆ لەگەڵ گەل دا بکات بە هۆی پێدانی بەرنامەی چاکسازی لە ژیانی سیاسیدا، وە بەشداریان پێ بکات بۆ ئەوەی لایەنگری زۆر بەدەست بهێنن.

---

(٤٥) زاهیر محەمەدی و یاسین حاجی زادە، فەرهەنگی سیاسیی(ئارش)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپ نەنوسراوە، ساڵی ٢٠٠٦، ل ١٧١ .

(٤٦) وەرگیراوە لە : مسعود عبدالخالق، مەوسوعەی جودی، نووسینگەی تەفسیر، چاپی یەکەم، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٨، ل ٥٧٠ .

لە لایەکی دیکەوە یاساناسی ناوداری فەرەنسی" ئەندریە هۆریـۆ" بـەم شـێوەیە پێناسەی حزبە سیاسییەکان دەکات:(حزبەکان ڕێکخستنی بـەردەوامن و لەسـەر ئاستی نیشتمانی و ناوچەیی کار و چالاکییان هەیـە، لـە پێنـاو بەدەسـتهێنانی پشتگیری گەل، بە مەبەستی گەیشتن بە دەسەلات بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتێکی دیاری کراو) [٤٧].

پاشان ئەگەر بێینە سەر باسی مێژووی پارتە سیاسییەکان و بنچینەی سـەرهەڵدانی دەبیـنین پێوەندییـەکی زۆری بـە پەرەسـەندنی دەوڵـەتی مـۆدێرن و دیمـوکراتی پەرلەمانییەوە هەیە لە ئەورووپای خۆرئاوا و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

"بلامبورا" لەگەڵ "موریس دوڤرجیە" کۆکن لەسەر ئەوەی بیرۆکەی حزب یەکەم جار لـە ئەورووپا سەری هەڵداوە، لە سەدەی نۆزدە لە ئینگلترا بە شـێوەیەکی ڕوون دوای ڕیفـۆرمی هەڵبژاردن لە سـالی ١٨٣٢ دا، لـە ولاتـە یـەکگرتوەکانی ئەمـەریکا حزبـی سیاسـی دەرکەوتن لە ، سەردەمی سەرۆك "ئەندرۆ جاکسۆن" لە سالانی ١٨٣٠.

پاشان پارتە سیاسییەکان فرەوانبونیان بە خۆیەوە بینی و لـە ولاتـانی تـردا سـەریان هەڵـدا وەك ئـەڵمانیا و فەرەنسـا [٤٨]، لەگـەڵ ئەمەشـدا، کـە ئینسـکلۆپیدیای کۆمەڵناسی کە ئینسکلۆپیدیای جیهانییە لەبارەی سەرهەڵدانی حزبـە سیاسـییەکان هەمان مێژووی تۆمار کردووە و دەڵێ: (هەتا سالی ١٨٥٠ لە هیچ ولاتێك حزبایەتی لێ نەبووە، بەو واتا و پێناسەی کە ئێستە بۆ حزب دەکرێـت). کـە لـە قۆناخـەکانی دواتردا ئـەزموونی حزبایـەتی لـە کۆمەڵگـەکانی دیکـەدا بـەدیار کـەوتن و ڕۆڵـی بەرچاویان گێڕا لە وەبەگەڕخستنی کۆمەڵ لە کایە جۆربە جۆرەکاندا.

---

(٤٧) وەرگیراوە لە : عوسمان عەلی وەیسی، حزب لە کۆمەڵگای سەردەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، سالی ٢٠٠٩، ل ٢٢-٢٣ .

(٤٨) نقلا عن : د.حسان محمد شفيق العاني، الانظمة السياسية و الدستورية المقارنة، بدون مطبعة و طبعة، سنة ٢٠٠٧، ص ٢٥٦ .

پاش شیكردنەوە و پێناسەكردنی چەمكی پارتە سیاسییەكان و ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی سەرهەڵدانی و ئەو ڕۆڵە ئەكتیڤەی كە لە كۆمەڵگەدا ئەنجامی دەدات. لێرەدا ئاماژە بە پارتە سیاسییەكان دەكەین وەك یەكێك لەو كەناڵانەی كە ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لە فەراهەمكردنی ڕۆشنبیریی سیاسیدا. بۆیە كاتێك كە باس لە پارتە سیاسییەكان دەكەین لە بەدیهێنانی ڕۆشنبیریی سیاسیدا، دەبینین كەوا پارتە سیاسییەكان بە یەكێك لە گرینگترین میكانیزمەكانی نوێكردنەوەی كولتووری دادەنرێت دەتوانێت لە ڕێگەی بەرنامەكانی ڕۆشنبیركردنی سیاسییەوە بەها نوێیەكان بخاتە دەروونی تاكەكانەوە و زانیاریی سیاسی پتریان پێ بدات، لەگەڵ ئەوەی دەتوانێت جەماوەر تەیار و ئاراستە بكات بۆ ئەنجامدانی بەرنامەی گەشەپێدان بەهەوڵ و ماندووبوونی خۆیان كە جگە لە شوێنەوارە مادییەكانی، چەند شوێنەوارێكی مینۆكیشی (گوزارەی) دەبێت لە بواری نوێكردنەوەی گیانی دەستپێشخەری و هیواداری، هەروەها قایلكردنی جەماوەر بۆ سود و كاری هاوبەش و جەختكردن لەسەر وابەستەگیان بۆ سیستەمی سیاسی [٤٩].

حزبی سیاسی هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە بۆ بە دیهێنانی ئامانجێكی دیاری كراو دادەمەزرێ و كۆمەڵە ئەركێكی سەرەكیی لە كۆمەڵگە هەیە، یەكێك لەو كارە سەرەكییانەی كە پێی ئەنجامی دەدات برێتییە لە پێكهێنانی ئاراستە و هزرەكان كەواتە حزب ڕۆڵی هەیە لە پێكهێنان و ڕەخساندن یان لە دارشتنەوە و پاراستنی هەستی سیاسی لەلای تاكەكان، كەوا حزبەكان بەخشینی زانیاریی و ئاشكراكردنی بۆ هاووڵاتییان لە میانەی ڕۆژنامە و بلاوكراوەكان و كۆبوونەوە و كار و چالاكییەكانی حزب) [٥٠].

بۆیە دەبینین پارتە سیاسییەكان فاكتەرێكی گرینگن لە پرۆسەی پەروەردەكردندا ئەمەش لە ڕێگەی چەسپاندنی بەها و چەمك و بڕواگەلی سیاسی دیاركراوەوە لەناو كۆمەلانی خەڵكی بەمەبەستی ئاراستەكردنی تاكەكان ڕووە و سیاسەتێكی دیاركراو. كەوابێ پارتە

---

(٤٩) د. كمال مەنوفی، هەمان سەرچاوە پێشوو، ل ٢٣٤ .

(٥٠) د.حسان محمد شفيق العانی ، نفس المصدر السابق ، ص ٢٥٨ .

سیاسییەکان ڕۆڵێکی دوو جەمسەری لە پرۆسەی پەروەردەکردنی سیاسیدا دەگێڕن، کە ئەویش خۆی لە پشتگیریکردنی ڕۆشنبیریی سیاسی باو و خولقاندنی ڕۆشنبیریی سیاسی نوێدا دەبینێتەوە. ڕۆڵی حزب لە بواری گۆڕانکاریی و فەراهەمکردنی ڕۆشنبیریی دا بەستراوەتەوە بە چەند فاکتەرێکەوە کە دیارترینیان بریتییە لە ئایدیۆلۆژیا و ڕێکخستنی حزبی و سەرکردایەتی کاریزمایی، واتە دەبێت حزب ئایدیۆلۆژیایەکی ناپاریزکاری هەبێت و ئایدیۆلۆژیایەك بێت داوای گۆڕینێکی ڕیشەیانەی ڕەوشەکانی کۆمەڵگە بکات بۆ ئەوەی بتوانێت کولتوورێکی سیاسی نوێ بخولقێنێت، لەلایەکی دیکەشەوە هەتا ئۆرگانەکانی حزب چالاکانەتر و بەربلاوتر کار بکات و زیاتر جەماوەری میللی لە خۆبگرێ زۆر زیاتر کاریگەری دەبێت لە بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی سیاسیدا.

بەهەمان شێوەش پێوەستبوونی حزب بەسەرکردایەتییەکی کاریزماییەوە توانای حزب پتر دەکات لە بەدیهێنان و پەرەسەندنی ڕۆشنبیریی[٥١].

لە کۆتای دا دەڵێین هەبوونی پارتی سیاسی لەسەر گۆڕەپانی سیاسی وڵات، پێداویستییەکی هەرە سەرەکییە لە پێداویستییەکانی دیموکراتی و بەبێ هەبوونی پارتە سیاسییەکان ناکرێت لە وڵاتێك باس لە هەبوونی دیموکراتی بکرێت، چونکە پارتە سیاسییەکانن ئەو ڕەوشە دیموکراتییە دەخولقێنن لە وڵاتێکی دیموکراتدا، هەر لەبارەی ڕۆشنبیرکردنی سیاسیانەی جەماوەرەوە پارتە سیاسییەکان وەکو قوتابخانەیەکن بۆ ڕۆشنبیرکردنی جەماوەر لە ڕووی سیاسی و هەموو ئەو بابەت و پرسە و بوارانەش کە بە سیاسەتەوە گرێدراون یان سیاسەت ساتوسەودایان لەگەڵدا دەکات وەك پرسەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی)[٥٢].

---

(٥١) د.کەمال مەنوفی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٧ .

(٥٢) ڕزگار محەمەد قادر، لە پێناو کوردستانێکی نوێ دا، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٢٢١-٢٢٢ .

پارتە سیاسییەکان لە ڕێگەی کۆبوونەوەی حزبی و بڵاوکراوە و کەناڵە ڕاگەیاندنەکانی خۆیانەوە بابەتە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان تاوتوێ دەکات و دەیانکەنە بابەتی گفتوگۆ و ڕا گۆڕینەوە کە لەم کردارەدا جەماوەرێکی زۆر گوێیان لێ ڕادەگرن و بەشداریان لەگەڵدا دەکەن و لە ئەنجامی ئەوەشدا فێری شتی نوێ دەبن و لەسەر شتی نوێ پەروەردەدەبن و ڕۆشنبیریی سیاسی نوێش بونیاد دەنێنن.

### (٢.٢.٢) ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی: Civil Society

ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی یەکێکی دیکەیە لەو ڕێگە و کەناڵە سەرەکییانەی، کە ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەدا بەدی دەهێنێت و بڵاوی دەکاتەوە و تاکەکان ڕۆشنبیر و هۆشیار دەکات لەسەر بابەت و دیاردە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان. ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی دەزگەیەکی فەرمانڕەوای نییە، بگرە جۆرێکە لە چالاکی ئارەزوومەندانە، لەسەر ڕۆشنبیرییەکی ئارەزوو مەندانە، کاردەکات لە ڕێگەی چالاکوانە کۆمەڵایەتییەکان و ڕۆشنبیرەکان لەسەر وەگەڕخستن و ڕۆشنکردنەوەی ڕۆح و هەستی کاری بە کۆمەڵ و پڕکردنەوەی ئەو بۆشایانەی کە دەوڵەت ناتوانێت پڕیان بکاتەوە بە هۆی زۆربوونی کارەکان[٥٣]. واتە دەوڵەت و حکوومەت هەرچەندە فرەوان بێت و دامودەزگەی پتری هەبێت هەرگیز ناتوانێت سەرتاپای پێداویستییەکانی کەرت و بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵگە پڕبکاتەوە و هەڵبسوڕێنێ. ئەمەش وا دەکات کە ئۆرگانی دیکە لەناو دەوڵەتدا هەبن وەکو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی تاکو ئەو کەلێنانە پڕبکەنەوە، ئەم ڕێکخراوانە پێویستە لەسەریان ببنە بنەمای دروستکردنی پردی دایەلۆگ لە نێوان دەسەلات و هاوولاتیاندا، دایەلۆگێکی شارستانییە لەسەر بنەمای

---

(٥٣) د. سهيل عروسي، المجتمع المدنى و الدولة، طبعة الاولى، دار الفكر، دمشق – سوريا، سنة ٢٠٠٨، ص ٨٧ .

گوێگرتن و خستنە ڕووی خواستە ڕەواکان لە لایەن سەر جەم چین و توێـژەکانی کۆمەڵگـە .[54]

ڕێکخراوی شارستانی ئەکتیڤ و کارا لە هەر سیستـەمێك و کۆمەڵگەیـەکی دیموکراتیـدا ڕۆڵێکی چالاکانەی هەیە لە برەودان بە بزاڤی ڕۆشنبیریی و دەبنە سـەکۆیەکی دایـەلۆگ و گفتوگۆ و پردی پێوەندی لە نێوان هاوولاتیان و دەسەڵاتی سیاسی و وە هۆشـیارکردنەوە و ڕۆشـنبیرکردنی تاکـەکان بەرامبـەر بـە پرۆسـەی سیاسـی، ئاشـکرایە زانایـانی بـواری کۆمەڵناسی بە گشتیی بایەخ و گرینگی گەورەیان داوە بە پرسەی پێناسەکردنی چـەمك و زاراوەکان، کۆمەڵگەی شارستانی وەکو هـەر چـەمکێکی تـر لـەم حاڵەتـە بـەدەر نییـە، زاراوەی کۆمەڵگەی شارستانی بە یەك ڕستەی جێگیر پێناسە ناکرێ بگرە بە شێوازی جۆر بەجۆر گوزارشتی لێکراوە، ئەرکی کۆمەڵگەی شارستانی لەوەدا چڕدەبێتەوە کە گرووپێـك لە خەڵك لە دەوری یەك کۆببنەوە بۆ ئەوەی کێشە هاوبەشەکانیان چارەسەر بکـەن، بۆیـە کۆمەڵگەی شارستانی بریتییـە لـە " کۆمەڵگەیـەك کـە ئەندامـەکانی ئەوەنـدە ئـازادن دەتوانن بۆ ڕاپەڕانـدنی کاروبـارە سیاسـی و کۆمەڵایەتیـەکانیان ڕێکخـراو و ئەنجومـەنی جۆراوجۆر پێك بهێنن" [55]. کۆمەڵگەی شارستانی خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆیان هەیە، کە ئامانجیان ئەوەیە رسیستەمێکی سیاسی دیموکرات یان ئایدۆلۆژییەکی تەندروست یـان حکوومەتێکی کارا بێننە سەر کار، لە ڕێگەی ئەو کار و چالاکییانەی کە لە کۆمەڵگـەدا ئەنجامی دەدەن و هەوڵ دەدەن بۆ چێکردنی تاکێکی ڕۆشنبیر و کۆمەڵێکی هۆشیار.

کۆمەڵگەی شارستانی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا نموونەیـەکی نـوێی سیسـتـەمێکی دیـموکراتی بەردەوام و وەرچەرخاوە، کۆمەڵگەی شارستانی لای هزرڤانی ئیتاڵی ئەنتۆنیۆ گرامشی لـە پێوەندییە ڕۆشنبیریی ئایدیۆلۆژییەکان پێك دێت، بەو پێیەی هەموو چـالاکییە گیـانی و

---

(٥٤) ڕابەر تەلعەت، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٨ .

(٥٥) دامەزراوەی میهەن، کۆمەڵگەی مەدەنی هێزێکی نوێ، و: کۆسار فەتاحی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٦، ل ٨ .

ئەقلانییەکان لە خۆدەگرێت، کەواتە کۆمەڵگەی شارستانی لای گرامشی کات و ساتی ئەرێنی و کارا لە پێشکەوتنە مێژووییەکانە، بۆیە گرامشی جیاواز لە فەیلەسووفان و هزرڤانانی دیکە پانتاییەکی نوێی خستە سەر ناوەڕۆکە سیمانتیکییەکەی کێشمەکێشی ئایدیۆلۆژیانە، چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی بەو بۆچوونە پانتاییەکە بۆ کێشمەکێشی ئایدیۆلۆژیانە، جا ئەگەر جڤاکی سیاسی پانتاییەك بێت بۆ کۆنترۆڵی سیاسی بە هۆی هێز و دەسەلات، ئەوا کۆمەڵگەی شارستانی پانتاییە بۆ هەژموونی ڕۆشنبیریی و ئایدۆلۆژی (٥٦).

کەواتە لەم تێڕوانینەی گرامشی بۆ کۆمەڵگەی شارستانی دەگەینە ئەو ڕاستییەی کەوا ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی ڕۆڵێکی چالاکانەیان هەیە لە هەژموونی ڕۆشنبیریی و برەدان بە ڕەوتی هۆشیاری لەنێو کۆمەڵگەدا، لەلایەکی دیکەوە هزرڤانی ئینگلیزی "تۆماس بین" ١٧٣٧ – ١٨٠٩ یەکەمین کەسە کە جیاوازی کردووە لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگەی شارستانی، بەبۆچوونی ئەو (دەوڵەت قەوارەیەکی دروستکراوە و سەپێنراوە بەسەر کۆمەڵگەدا و ڕێگە بە ڕۆڵی تاکەکان نادات، کە کۆششی ئارەزوومەندانە بدات، لەبەرئەوەی دەوڵەت بەسرووشتی خۆی خاوەن و دەسەلاتە، بەڵام کۆمەڵگەی شارستانی بە پێچەوانەی کۆمەڵگەی سیاسی (دەوڵەت) دەیچوێنیٚ و پێکیان دەگرێتەوە، کۆمەڵگەی شارستانی بەرای ئەم هزرڤانە تەنیا گەشەسەندوو دەبیٚ بە گەشەسەندنی چاکەکانی شارە و بەها و شکۆمەندییە شارستانییەکان وەکو هاوکاری، خۆشەویستی نێوان مرۆڤەکان، ڕۆحی بە کۆمەڵ، چالاکی ئارەزوومەندانە، یەکسانی، دادپەروەری، بەرەو کاری بیٚ لایەنی و... هتد) کۆمەڵگەی شارستانی تمپیلی ئەم جۆرە چاکانە دەکات، کە ئەمانەش دەبنە پالپشتییەك دژی حکوومەتی تۆتالیتاری و دژی بەزۆر ڕۆچوونی هیلاکبەرانە، کۆمەڵگەی

---

(٥٦) د.کەریم ابوحلاوە، گیروگازی چەمکی کۆمەڵی مەدەنی، و: اسماعیل کوردە-ڕەوشت ڕەشید=نوری بێخاڵ، چاپی دووەم، لە بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٤، ل ٨٠ – ٨٣.

شارستانی پانتایی ڕەوشتی بەرجەستە دەکات لەنێوان حاکم و مەکوم، چەمکی کۆمەڵگەی شارستانی بریتییە لەو گۆڕەپانەی کە دامەزراوەی ئارەزوومەندانە لە خۆدەگرێت لە نێوان تاك و دەوڵەتدا (٥٧).

ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی ڕۆڵێکی ئەوەندە گرینگیان لە بەڕێوە چوونی پرۆسەی دیموکراتی هەیە بە جۆرێك زۆر لە شارەزایان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن و دەڵێن ئەستەمە قسە لەسەر دیموکراتی لە وڵاتێك دا بکرێت ئەگەر ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی لەو وڵاتە دا نەبن، بەڵام لەلایەن دەسەڵاتی سیاسی و پارتە سیاسییە فەرمانڕەوایەکان پەکیان خرابێ و کۆنترۆڵکرابن، بەڵام دەبێت ئەوەش لە یاد نەکەین کە کۆمەڵگەی شارستانی بەبێ جۆرێکی تایبەت لە زانیاریی و ڕۆشنبیریی و مەعریفە و هۆشیارییەکی پتەوبەرز ئەستەمە دروست ببێت، دەکرێت دوو ئاکاری سەرەکیی ئەو شێوە زانیاریی و مەعریفە و ڕۆشنبیرییە جیابکەینەوە، کە بۆهاتنە کایە و بەرقەراربونی کۆمەڵگەی شارستانی پێویستن کە بریتین لە ڕەخنەییبوون و ڕێژەیبوون. ڕەخنەیبوون بەو واتایەی کەلەبەرامبەر ستراتیژەکانی بێدەنگکردن و دیسپلینکردن و بێمافیدا بێدەنگ نابێت، ڕێژەیبونیش بەو واتایەی بەناوی هەقیقەتێکی ڕەهاوە نادوێت و بەناوی ئەو ڕاستیشەوە کەس بێدەنگ ناکات و دنیا و دیاردەکان بە شێوەیەکی سادە بۆ ڕەش و سپی و دۆست و دوژمن دابەش ناکات (٥٨).

لە کۆتایدا دەڵێین کاتێك کەوا ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی پۆلێن دەکرێت بۆچەندین ڕێکخراو و گرووپ یەکێك لەو گرووپانە پێیان دەوترێت ڕێکخراوە هزری و ڕۆشنبیرییەکان، ئەو ڕێکخراوانە دەگرێتەوە کە بایەخ بە پتەوکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی

---

(٥٧) شوقي جلال، المجتمع المدني و ثقافة الاصلاح، الطبعة الاولى، دار العين، القاهرة، ٢٠٠٥، ص٣١-٣٤.

(٥٨) مەریوان وریا قانع، شوناس و ئاڵۆزی، چاپ نەنوسراوە، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١٨٠.

ڕۆشنبیریی تویژە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگەیان دەدەن لە بوارێکی دیارکراوی ڕۆشنبیریی، بۆ نموونە ئەو ڕێکخراوانەی کە بایەخ بە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی یاسایی یان سیاسی یان کۆمەڵایەتی دەدەن، هەروەها ئەو ڕێکخراوانەش دەگرێتەوە کە هەوڵی پراستن و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی و کولتووری تویژێکی نەتەوەیی یان ئاینی یان ئاینزانی دیاری کراو دەدەن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زانکۆ و سەنتەرانەی تۆژینەوەش کە بایەخ بەلایەنی هزری و رۆشنبیری دەدەن.

## (٣-٢-٢) دەزگەکانی ڕاگەیاندن: Mass Media

دەزگەکانی ڕاگەیاندن یەکێکی دیکە لە کەناڵەکانی بەدیهێنانی ڕۆشنبیریی سیاسی و ڕۆڵێکی گرینگ و بەرچاو دەبینێت لە هەموارکردن و گۆڕینی بەها و بۆچوون و ئاراستەی تاکەکان، لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا و بەشداری دەکات لە ئامادەکردنی هاوولاتییان بۆ گێڕانی ڕۆڵێکی ئەکتیڤ و سوودمەند، لێرەدا دەزگەکانی ڕاگەیاندن مەبەستمان پێی هەر سێ جۆری ڕاگەیاندنی بینرا خوێنرا و بیستراوە وەك تەلەڤیزیۆن و ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕادیۆ و تۆڕی ئینتەرنێت، کە ئەم ئامرازانە ڕۆڵێکی گرینگ لە پرۆسەی پەروەردەکردنی سیاسییدا دەگێڕن، بەو پێیەی کە لە ڕێگەی ئەم ئامرازانەوە تاکەکان چەکدار دەبن بە زانیارییە سیاسییەکان و بەشداری دەکەن لە پێکهێنان و سەقامگیربوونی بەها سیاسییەکان.

لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا ئامرازەکانی ڕاگەیاندن لەسەر ئاستێکی فرەوان گەشەدەکەن و گواستنەوەی زانیاریەکان لەبارەی بریار و سیاسەتەکانی چینی حوکمران بۆ جەماوەر و هەروەها گواستنەوەی زانیارییەکان لەسەر داخوازی و کاردانەوەی جەماوەر بۆ

بژاردەی فەرمان رەوا. ئەو دەرپەڕینە بەردەوامەی زانیارییەکان لە سەرەوە بۆ خوارەوە و بەپێچەوانەشەوە جەخت لەسەر بەها و ڕۆشنبیرییە سیاسییە باوەکان دەکاتەوە (٥٩).

بۆیە دەزگەکانی ڕاگەیاندن لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەهۆی پێشکەوتنی بەرچاوی تەکنۆلۆژیاوە ڕۆڵێکی ئەکتیڤ دەگێڕن لە پێکهێنانی ڕۆشنبیرییەکی سیاسی نوێ دا.

لەم ڕوانگەشەوە کە باس لە میدیا دەکەین بەشێوەیەکی گشتیی شرۆڤەی دەکەین بە پێی ئەو ئەرك و چالاکییانەی کە ئەنجامی دەدات دابەشمان نەکردووە بۆ سەر میدیای ئەهلی و میدیای حزبی.

پێش ئەوەی کەباس لەدەزگەکانی ڕاگەیاندن بکەین وەك ئامرازێکی سەرەکیی بۆ فەراهەمکردنی ڕۆشنبیریی سیاسی، دەمانەوێت تیشکێك بخەینە سەر پێناسەی چەمکی ڕاگەیاندن و مێژووی سەرهەڵدانی.

پێناسەکردنی چەمکی ڕاگەیاندن بە چەندین شێواز گوزارشتی لێکراوە و هەندێك پێیان وایە "ڕاگەیاندن پەیامێکی هزرییە و چەند ناوەڕۆکێکی جیاجیا و ئامانجی جیاواز لە خۆدەگرێ بەپێی ئەو ناوەڕۆکانەی کە گوزارشتی لێ دەکات، بەو نیازەی لەڕێی هۆکارە جیاجیاکانی پێوەندییەوە لەگەڵ خەڵکی دا بدوێ" (٦٠). هەروەها لە فەرهەنگی "ویستەردا" هاتووە کە (ڕاگەیاندن ئەو کردەوەیەیە کە تیایدا ئاڵوگۆڕی چەمکەکان لە نێوان کەسەکاندا دەهێنێتەکایەوە بە بەکارهێنانی هێمای زانراو، یان بریتییە لە زیادکردنی هۆشی جەماوەر بەهەواڵ و زانیاریی و ڕا بەمەبەستی کارتێکردن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ) (٦١).

---

(٥٩) کنێر عەبدولا ، سەرچاوەی پێشوو، ل٦١ و ٦٢.

(٦٠) د.هانی ئەلرەزا و د. رامز عەممار، ڕای گشتی و ڕاگەیاندن و بانگەشەکردن، و: ئەحمد سەلام، چاپخانەی ئەلەند، چاپ و ساڵ نەنوسراوە، ل ١٠١.

(٦١) وەرگیراوە لە : هەڤاڵ ئەبوبەکر، ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی کوردی، چاپی یەکەم، ناوەندی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٢، ل ١٦.

لەلایەکی دیکەوە میدیا بەم شێوەیەش گوزارشتی لێکراوە کە (ڕاگەیاندن بریتییە لە هێنانی چەند ڕا و بۆچوون و بابەتێکی ڕۆشنبیریی، وە چەند ڕاستییەکی بابەتییە کەهەندێ کاریگەریان هەیە لەسەر بیروباوەڕ و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی ئەوانەی کە شتەکانیان بۆ دەگوازرێنەوە) [٦٢].پاشان ئەگەر باسێکی کورت لە مێژووی ڕاگەیاندن بکەین دەبینین کە ڕاگەیاندن مێژوویەکی کۆنی هەیە و دەتوانین بڵێین لەگەڵ دروستبوونی مرۆڤ و نیشتەجێبوونی لەسەر زەویدا بوونی هەبووە، چونکە ئەگەر ڕاگەیاندن شێوەیەك لە شێوەکانی پێوەندیکردن، کەناوە زانستییەکەیەتی، بەم واتایە هەر لەسەرەتای دروستبونی ئادەمیزادەوە پرۆسەی ڕاگەیاندن دەستی پێکردووە و مرۆڤ خۆی پراوەی کردووە لە میانەی قسە و وتووێژەوە بەکاری هێناوە بۆ قەناعەت پێهێنانی بەرامبەر و تێگەیاندنی، پاشان لەگەڵ گەشەکردن و بەرەو پێشچوونی مرۆڤەکان و گەشەکردنی کایە مرۆڤایەتیەکان و پەرەسەندنی پێوەندییە مرۆی و نێودەوڵەتیەکان، ڕاگەیاندنیش وردە وردە گەشەی کردووە و بە چەندین قۆناخی جۆراوجۆردا گوزەری کردووە تا گەیشتۆتە ئەم قۆناخەی ئێستەی [٦٣]. بەم شێوەیە ڕاگەیاندن تەنیا لە چوارچێوەیەکی تەسکی بیستن و نوسیندا نەماوەتەوە و چەندین پێشکەوتنی گەورەی بە خۆیەوە بینیوە کە ئەو هەموو دەزگەی بینین و بیستن و تەکنیکی نوێیە هاتۆتە ئاراوە لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و کەناڵی ئاسمانی و ڕۆژنامەگەری بە هەموو جۆرەکانییەوە تا ئەو ئاستەی کە خۆی لە مەیدانەکەدا سەپاندوە و بە دەسەڵاتی چوارەم ناو زەند دەکرێ [٦٤]، بۆیە دەبینین ڕاگەیاندن لە لە کۆن و ئێستەشدا ڕۆڵی گرینگتر و زیاتر دەبینێت لە هۆشیارکردنەوە و ڕۆشنبیرکردنی تاکەکاندا

---

(٦٢) ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی، ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی ئیسلامی، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوار چرا، چاپی یەکەم، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٨، ل ١.

(٦٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٣.

(٦٤) بۆ زیاتر زانیاری و شارەزای لە مێژووی ڕاگەیاندن، بڕوانە: هەڤاڵ ئەبوبەکر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣.

سەبارەت بە بوارە جۆربەجۆرەکان لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە.
ڕاگەیاندن یەکێکە لە پێکهاتەکانی سیستەمی سیاسی، بەپێی ئەو کاریگەرییەی کە هەیەتی لەسەر هۆشیارکردنەوەی هاووڵاتی و دروستکردنی ڕای گشتیی، لە هەمانکاتدا دەزگەکانی ڕاگەیاندن ڕۆڵێکی کارا دەگێڕێت لە بەشداری سیاسی هاووڵاتییاندا، بۆیە شارەزایانی ئەو بوارە لەنێو پاڵنەرە کولتووریەکان بۆ بەشداری سیاسی باس لە کاریگەری ڕاگەیاندن دەکەن لەو بارەیەوە [٦٥]، یەکێك لەو ئەرکە سەرەکییانەی کە دەزگەکانی ڕاگەیاندن بە ئەنجامی دەگەیەنێ بریتییە لە ئەرکی پێکهێنانی ڕاو بۆچوونەکان لەلای تاك و کۆمەڵ و میللەت، چونکە ئەرکی میدیا یارمەتیدانی تاکەکانی کۆمەڵە بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکان و ئاگاداربوون لە ژینگەی دەوروبەر بۆ ئەوەی خۆیانی لەگەڵدا بگونجێنن، ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەم کارە لە ڕێگەی میدیاوە کارئاسانییەکی تەواوی بۆ تاکەکان دەستەبەر کردووە [٦٦].
بەو پێیەی کە بەشێکە لە زنجیرەی پەرەسەندنی تەکنۆلۆژی، دەزگەکانی ڕاگەیاندن ڕۆڵێکی باش دەگێڕن لە کاری گەشەسەندندا لە ڕووی چەمکی مرۆییە بەر فرەوانەکانەوە وەك باری سیاسی و ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتی و تەندروستی و نیشتمانی و...هتد.
لە کۆتاییدا دەڵێین لە ڕێگەی کەناڵەکان و ئامرازەکانی ڕاگەیاندنەوە ڕۆژانە و بەشێوەیەکی بەردەوام کۆمەڵێك بیر و باوەڕ و زانیاریی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی دەگوازرێنەوە بۆ جەماوەر، گرینگی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لەپرۆسەیەکی لەم شێوەیەدا ئەوەیە کە ئەم کەناڵانە وزە و توانایەکی لە ڕادەبەدەریان هەیە بۆ دەست بەسەردا گرتنی ئەقڵ و هۆشی

---

(٦٥) خالید عومەر ڕەشید، پێگەی ڕاگەیاندن لە سیستەمی سیاسیی دا، گۆڤاری ڕۆشنگەری، ژمارە ٢٣ تا ٢٤، لە بڵاوکرنەوەکانی نێوەندی ڕۆشنگەری بۆ لێکۆڵینەوەی هزری و سیاسیی، ل٤١ .

(٦٦) محەمەد عەبدوڵلا کەلاری، جیهانگیری میدیا، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی، دهۆك، ساڵی ٢٠٠٩، ل ١٥٠.

خەڵکی و ئاراستەکردنیان بە زەبری ئەو کاریگەرییەی کە دروستی دەکات. ئەم کەناڵانەی ڕاگەیاندن ڕۆڵیان هەیە لە خولقاندنی ڕۆشنبیرییەکی گشتیی و جەماوەریدا، لەگەڵ ئەوەشدا دروستکردنی وابەستەبوونی نەتەوەیی و نیشتمانی و وروژاندنی هەست و سۆزی جەماوەر لەپاڵ پاراستنی سەقامگیری و ئاسایشی سیستەمی سیاسییدا [٦٧].

بەکورتی وای دەبینین کە بەبێ بوونی دەزگەکانی ڕاگەیاندن بە تایبەتیتر ڕاگەیاندنی ئازاد و سەربەخۆ پرۆسەی دیموکراتی تەواو نابێ و بەڕێوە ناچێ و فاکتەرێکی سەرەکیی و بەرچاون لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی سیاسی لە میانەی بەرنامەی هەمەجۆرەوە کە لەم دەزگەیانەوە پەخش دەکرێن تاکو ڕۆشنبیریی سیاسی لای تاکەکانی کۆمەڵگە بەرزبکاتەوە.

## (٤.٢.٢) خێزان و قوتابخانە

لەپاڵ ئەو ڕێگە و کەناڵانەی کە باسمانکرد لە بەدیهێنانی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەیەکی دیموکراتدا، جێگەی خۆیەتی کە ئاماژەیەکیش بە ڕۆڵی خێزان و قوتابخانە بکەین، **خێزان** بە گرینگترین ئامرازەکانی پەروەردەکردنی سیاسیی دادەنرێت و مەزنترین کاریگەریی هەیە لەسەر ژیانی تاکەکان، چونکە خێزان یەکەم گرووپ و جێنشینگەیە کە تاك تیایدا دەژی و پەروەردە دەبێ و هەموو پێداویستییە بایۆلۆجی و دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانی تێدا تێر دەکات، لە بەرامبەریشدا هەموو ئەو زانیاریی و بەها و دابونەریتانەی کە لە خێزاندا هەیە بۆی دەگوازرێتەوە بە باش یان بەخراپ [٦٨].

دروستکردنی تاکێکی ڕۆشنبیر و دەوڵەمەند بە ڕۆشنبیرییە جۆربەجۆرەکان و لەنێوانیشیاندا ڕۆشنبیریی سیاسی بەشێکی گرینگی ڕادەوەستێ لەسەر ئەو ژینگەیەی کە

---

(٦٧) رابەر تەلعەت، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٨ .

(٦٨) کنێر عەبدولا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٣.

لە خێزانەکەی دا بونی هەیە. بۆیە تا چەندە خێزان خوێندەوار و هۆشیاربێت بە پرسە جیاوازەکان دەبێتە دەروازەیەکی سەرەکیی کە تاك لێیەوە پەروەردە دەبێت وپێدەگات ورۆشنبیردەبێت قوتابخانەش ڕێگەیەکی دیکەیە لەو ڕێگەیانەی کەسەرچاوەی پەروەردەکردن و فێرکردنی تاکەکانە کە لە دوای خێزان وێستگەیەکی دیکە کە تاك تیایدا پێیدا تێپەڕ دەبێ، بۆیە دەشێت قوتابخانە بەشداری بکات لە گۆڕینی سیستەمی کولتووری باو و هێنانی کولتووری نوێ، ئەویش لە ڕێگەی ڕۆشنبیرکردنی سیاسی و سیستەمی قوتابخانەوە، ڕۆشنبیرکردن لە ڕێگەی قوتابخانەوە لەڕێی چەند مادەیەکی دیاری کراوەوە دەبێت کە پڕ بن لە بابەتی کولتوری نوێ و لەگەڵیشیدا تەرخانکردنی مامۆستای لێوەشاوە و پسپۆڕ لەم بوارە. کە هەتا مامۆستا باوەڕی بە بەها و بابەتەکانی سیستەمی سیاسی زیاتر هەبێت، باشتر دەتوانێت ئەو بەهایانە لە دەروونی قوتابییەکاندا بچێنێ، هەتا پێوەندیی نێوان مامۆستا و قوتابی دۆخێکی تەندروست و دیموکراتیبونی پێوە دیار بێ و قوتابخانە زیاتر قوتابییەکان هانب دات بۆ پراوەکردنی کار و چالاکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی، زیاتر چاوەڕوانی ئەوەیان لێ دەکرێت کە ئامادەیی بۆ بەشداریکردنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و مەیلی کارکردن لایان زیاد بکات[٦٩]، بۆیە دەبینین قوتابخانە و مامۆستا و پێکەوە هاوکار و بەشدارن لە پەروەردەکردنی قوتابیەکی سەرکەوتوو و تاکێکی ڕۆشنبیر.

---

(٦٩) د. کەمال مەنوفی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٣ .

## بەشی سێیەم: پرسی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردیدا.

بۆ ئەوەی بەرچاو ڕوونییەکمان لەسەر ئەم پرسە هەبێت لە هەرێمی کوردستان، هەر بۆیە دەروازەی دووەمی توێژینەوەکە تەرخان کراوە بۆ لایەنی مەیدانی بەو مەبەستەی زیاتر جەخت لەسەر پرسێکی وەکو ڕۆشنبیریی سیاسی بکەین.

## (١.٣) ناسیۆنالیزم و سیستەمی سیاسی لە هەرێمی کوردستان.

### (١.١.٣) ناسیۆنالیزم و کولتووری کورد .

ناسیۆنالیزم، بەواتا گشتییەکەی دیاردەیەکی سرووشتی و ئاساییە، چونکە مرۆڤ هەر لە کۆنەوە، ویستویەتی لەگەڵ ئەو کەسانەدا تێکەڵاوی و پێوەندیی هاوبەشی هەبێت لەو زمانیان تێ دەگات و هەست دەکات کە کولتووررێکی هاوبەش و مێژوویێکی هاوبەش و کۆمەڵە ئامانجێکی هاوبەشی لەگەڵیاندا هەیە، لە هەمانکاتدا لە کەسان و خەڵکی بیانی کە سەر بەکولتوورێکی جیاوازبوون خۆی بەدوور گرتووە.

لە چەند سەدەی ڕابردوودا ناسیۆنالیزم بزوتنەوەیەکی کاریگەر و بەهێز و بەرچاو بووە و ڕۆڵێکی چارەنووساز و کاریگەری لە ئاراستەکردنی ڕووداوە جۆربەجۆرەکانی دنیادا بینیوە، کەم ڕوودا و پێشهاتی سیاسی یان ڕۆشنبیریی هەیە کە جێ پێکانی ناسیۆنالیزمی تیا دیار نەبێت، ناسیۆنالیزم لانیکەم لە شۆڕشی ١٧٨٩ی فەرەنساوە وبێگومان زۆر پێش ئەم مێژووەش ڕۆڵێکی سەرەکیی لە گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی جیهانی ڕۆژئاوا بە تایبەتی و جیهان بەگشتیی هەبووە [٧٠].

---

(٧٠) ڕێبین هەردی، ناسیۆنالیزم و وەرگێڕان، گۆڤاری ڕەهەند، گۆڤارێکی مانگانەی تیۆری کولتوورییە، چاپخانەی کاردۆ، سلێمانی، ژمارە(٢)، ٢٠١٠، ل ٥.

ناسیۆنالیزم وەك دیاردەیەکی سیاسی ـ مێژووی دەکرێت دوو واتا یان دوو ناوەڕۆکی لێك جیاواز و پێك ناکۆکی هەبێت کە لە پێوەندیی لەگەڵ بابەتی دەرکەوتنیدا بە پێوەندیی لەگەڵ ئامانجەکانیدا دیاری دەکرێن، لە لایەکەوە دەشێت ناسیۆنالیزم هاوتای ئازادی و یەکسانی و هەقخوازی بێت.

ئەمەش لەو کاتانە دا دەبێت کە نەتەوەیەکی ژێردەست لە دژی ستەم و داگیرکردن و لە پێناو ئازادیدا خەبات دەکات، یان لە لایەکی دیکەوە دەشێت ناسیۆنالیزم واتای شۆڤێنیزم و ستەم و ڕەگەزپەرستی بێت کاتێك نەتەوەیەکی سەردەست یان داگیرکەر بۆ درێژەدان بە داگیرکردن، یان چەوساندنەوەی کەمایەتی نەتەوەیی، یان بۆ پەلاماردانی نەتەوەیی دراوسێ ئایدیۆلۆژیای ناسیۆنالیزم بەکاردێنێت [٧١].

هەروەها لە ڕوانگەیەکی سیاسییەوە چەمکی ناسیۆنالیزم بەم شێوەیە گوزارشتی لێکراوە (ناسیۆنالیزم بریتییە لە خواستی لە بەرچاوگرتنی بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆ بەتەنیا، بەتایبەت لەو کاتانە دا کە ململانێ لەگەڵ بەرژەوەندیی نەتەوەکانی دیکە لە ئارادابێت) [٧٢].

وەك ئەنجامگیرییەکی ئەم بۆچوون و پێناسانەی کە ئاماژەمان پێدا دەتوانین بڵێین ناسیۆنالیزم بریتییە لە هۆشیاری ئەندامانی نەتەوە بەوەی کە خاوەنی تایبەتمەندییەکی بابەتی و خودی نەتەوەین، کە ئەمەش هەستی بەرز ڕاگرتنی کولتوور و زمان و مێژووی نەتەوە چێ دەکات. ناسیۆنالیزم هۆشیاری و هەڵوێستێکی

---

(٧١) ڕەفیق سابیر، کەلتوور و ناسیۆنالیزم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ١٨.

(٧٢) موسلح عەبدولقەهار ئیروانی، ئاین و ناسیۆنالیزم، ڕۆڵ و کاریگەری و پەیوەندی نێوانیان لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ لە هەرێمی کوردستان، نامەی ماستەر پێشکەشی کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی سەلاحەددین کراوە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٢٦.

تایبەتە بەرامبەر زمان و کولتوور و مێژووی نەتەوە و هۆشیاری و هەڵوێستێکی شکۆدارانە دەبەخشێتە تاکەکان.
کاتێك کە باس لە ناسیۆنالیزم دەکەین دەبێت باس لەو پێوەندییە بکەین کە لە نێوان ناسیۆنالیزم و نەتەوە دا هەیە،

بە جۆرێك کە ئارنست گیلنەر هزرڤانی ئینگلیزی لە پێوەندیی نێوان نەتەوە و ناسیۆنالیزم خاڵێکی زۆر گرینگ دەستنیشان دەکات کە ئەو خاڵەش برێتییە لەوڕاستییە سۆسیۆلۆژی و سیاسییەی کە دەڵێت: (ناسیۆنالیزم، نەتەوە و دەوڵەت نەتەوەش دروست دەکات، واتە بێدارکردنەوەی نەتەوە نییە بۆ هەستکردن بە بوونی خۆی، بگرە ناسیۆنالیزم نەتەوە دادەهێنێت لەو شوێنەدا کە نەتەوەیی تێدا نییە) [٧٣].
لێرەوە چ نەتەوە و چ دەوڵەت نەتەوە و چ کۆمەڵگە سیاسییەکانیش دروستبونیان شتێکی سرووشتی و ئەزەلی و خوداکرد نیین، بگرە دروستکراو و دەرهاویشتەی هەلومەرجێکی مێژووی و کولتووری و کۆمەڵایەتی و بگرە ئاینی و دواجار سیاسین.
ناسیۆنالیزم دووپاتی دەکاتەوە کە یەکبونی نەتەوەیی پێویستە لە ڕووی سیاسییەوە سەر بە خۆبێت، دەبێت سنووری نەتەوە و دەوڵەت هاوجووت بن یان دەخوازێت کولتوور و شێوەی دەوڵەت هاوئاهەنگ و تەبابن، بۆ ئەوەی کەلتوور و کیانێکی سیاسی پێکبهێنرێت. بەم واتایە ناسیۆنالیزم وەك سیستەمێکی هزری و بزاڤێکی سیاسی نەتەوە دروست دەکات [٧٤].
ئێستە ئەگەر لەژێر ڕۆشنایی ئەو باسەی سەرەوەدا کە ئاماژەمان پێ دا بۆ چەمکی ناسیۆنالیزم بمانەوێ سەرنجێ لە ناسیۆنالیزمی کوردی بدەین و بیخوێنینەوە دەگەین بەو ڕاستییەی کە ناسیۆنالیزمی کوردی، بە لێکدانەوەی لایەنی سیاسی و

---

(٧٣) هاوژین مەلا ئەمین، ناسیۆنالیزم و ئازادی و تاکەکەس، گۆڤاری ڕۆشنگەری، لە بلاوکراوەکانی نیوەندی ڕۆشنگەری بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری و سیاسی، ژمارە(٢٦)، ل ٦٣.
(٧٤) ڕەفیق سابیر، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩.

کۆمەڵایەتی و هزری و کولتوورییەکانی بۆ نەتەوەیەکی بێ دەوڵەتی ژێردەستە و نیشتمان داگیرکراوی وەك نەتەوەیی کورد نەك هەر نرخ و بایەخی مێژووی گەورەی هەیە، بگرە ئەوەشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ناسیۆنالیزمی کوردی تا چ ئاستێك لەژێر هەڕەشە و پەلاماردان دابووە [٧٥]. ناسیۆنالیزمی کوردی نوێنەری کولتوورێکی تایبەتە. کۆمەڵێك ئامانجی هاوبەش و ڕواڵەتی لێکچووی هەیە، لە هەمانکاتدا لە هەر بەشێکی کوردستان دا بە جۆرێ ڕەوش و تایبەتمەندیی خۆی وەرگرتووە، کە ناتواندرێت بە بەشێك یان تەواوکەری بزاڤی بەشێکی دیکەی دابنرێت [٧٦]. بۆ نموونە ناسیۆنالیزمی کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم ولە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی دا وەك کاردانەوە بەرامبەر دەسەڵاتی ناسیۆنالیستی تورك دەرکەوت، بەڵام ناسیۆنالیزمی کورد، بە پێچەوانەی ناسیۆنالیزمی تورك و فارس و عارەب، دەرفەتی ئەوەی بۆ نەڕەخساوە پرۆژەی ناسیۆنالیزمی خۆی لە بیر و ئایدیاوە بگۆڕێت بۆ کەتوار، لە جیاتی ئەوە ولاتە کۆلۆنیالە سەرکەوتووەکانی یەکەمین جەنگی جیهانی ولاتەکەیان دابەشکرد، ناسیۆنالیزمی کورد بەر پەلامارێکی گەورەی دەوڵەتی ناسیۆنالی نەتەوە سەردەستەکانی کوردستان کەوت، ئیدی وەك ناسیۆنالیزمێکی پەلاماردرا و ژێر دەستەکراو، کە نوێنەری کولتوورێکی داپلۆسێنراو، لە حاڵەتی داکۆکی لەخۆکردندا مایەوە، بە واتایەکی دی تا ئێستەش شەڕی ناسیۆنالیزمی کورد، پێش هەرشتێك، شەڕی خۆپاراستنە [٧٧].لێرەدا ئەگەر هەڵوێستەیەك لەسەر ناسیۆنالیزمی کورد بکەین هەست دەکەین کەوا ناسیۆنالیزمی کورد هەر لە ساتەوەختی

---

(٧٥) جەعفەر عەلی، ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١١.

(٧٦) ڕەفیق سابیر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٣.

(٧٧) هەمان سەرچاوەولاپەڕەی پێشوو.

سەرهەڵدانییەوە تاکو ئێستە کۆمەڵێ ئاریشەی تایبەت بە خۆی هەبووە، دیارە دەتوانیین بڵێن کە بەشێ لەو قەیران و ئاریشانە لەسەر ئاستی ناوچەکەدا گشتین و تەنیا پێوەست نین بە ناسیۆنالیزمی کورد، بگرە گرفتی زۆرێ لە ناسیۆنالیزمی گەلانی دیکەی ناوچەکەشە، واتە گرفتی ناسیۆنالیزمە لە پێوەندی بە کولتوور و شارستانییەتی ناوچەکە و ئیسلام و ئەو ناوەڕۆکە هزرییەی کە هەڵیانگرتووە لەگەڵ دەوڵەتی دوای کۆلۆنیالێزم، کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نوێنەری ناسیۆنالیزمێکی ترە واتە کۆلۆنیالێزم دروستی کردوە یاخود پاشماوەیەکی لاوازی شەڕەکان و دابەشکردنەوەی سیاسی و جوگرافی وڵاتانی ناوچەکەیە [(٧٨)].

پاشان ئەگەر بمانەوێت باسێك لە مێژووی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم بکەین لەناو کورد دا دەبینێین جیاوازی بیروڕا هەیە لەسەر دیارکردنی مێژووی سەرهەڵدانی ئەم بیرۆکەیە لە کۆمەڵگەی کوردی دا. کە هەندێك پێیان وایە سەرەتاکانی بیری نەتەوەیی کوردی بۆ سەدەکانی شازدە و حەڤدەی زایینی دەگەڕێتەوە، بۆ نموونە ئاماژە بە هەوڵەکانی نووسینەوەی مێژووی کوردی دەکەن و ڕاستەوخۆش باس لە کتێبی (شەرەفنامە)ی شەرەفخانی بەلیسی ١٥٤٣ — ١٦٠٤ دەکەن، بەڵام لە لایەکی دیکەوە نیمچە کۆدەنگییەك لە نێوەندە ڕۆشنبیرییەکان دا پەیدابووە کە شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لە ساڵی (١٨٨١) بە سەرەتای چەکەرەکردن و سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کوردی دا دەنرێت، چونکە ئەدەبیاتی شۆڕشەکە بە شێوەیەکی سەرەتایی چەمکە ناسیۆنالیستەکانی نەتەوە و جیاوازبوون بەکاردەهێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێبەرایەتی شۆڕش بۆ پاساودان و ڕەوایەلێدان بەو تێکۆشانەی دەستیان دابوویە و ئەو ئامانجانەی هەڵیان گرتبوو بەتایبەتیش خودی شێخ عوبەیدوڵلای

---

(٧٨) ئەبوبەکر عەلی، ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی، بەرگی دووەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٢٩ .

نــەهری کــە ڕۆڵــی ســەرکردەیەکی ڕەمــزی دەبینــی، بیرۆکــەی جیاوازبوونیــان هێنابووەکایەوە، هەروەها باسـی سـەربەخۆیی کوردسـتانیش یـاخوود کۆکردنـەوەی کوردەکان لەژێر دەسەڵاتێکی کوردی دا لە بەرنامەی شۆڕش دا بوو [٧٩].

بەم شێوەیە ناسیۆنالیزمی کوردی قۆناخ بەقۆناخ لە چەند ڕەهەندێکەوە بـە بنـەمای جۆراوجـۆرەوە بـەناو چـین وتوێـژەکانی کۆمەڵگـەی کوردیـدا ڕۆدەچـێت و خـۆی دەچەسپێنێت، لەسەرەتای سەدەی بیستەمیشدا ناسـیۆنالیزمی کـوردی زیـاتر خـۆی ڕێکدەخات و لەو پێناوەشدا چەندین پارتی سیاسی و ڕێکخراوی پیشەیی تایبەت بـە قوتابیان و مامۆستایان و ئافرەتان و پیشە جۆربەجۆرەکانی دیکە پێك دەهێنرێن و لە زۆرینەی شارەکانی کوردستان دا بلاّو دەبنەوە و تاکی کوردی لە خۆیان کۆدەکەنەوە.

ناسیۆنالیزمی کوردی وەك ناسیۆنالیزمی هەموو نەتەوەکانی دیکەی جیهان خـاوەنی کۆمەڵێك خواست و ئامانجی نەتەوەیی تایبەت بە خۆی بـووە. بـۆ ئـەم مەبەسـتەش کۆمەڵێك هۆکارهەبوونە کە ڕێگـە خۆشـکەربوون بـۆ گەشەسـەندنی ناسـیۆنالیزمی کوردی کەلێرەدا بەشێوەیەکی کورت ئاماژەیان پێدەدەین:

١. ڕەوشی کولتووری کورد، بەو پێیەی کە ناسیۆنالیزمی کورد بەرهەم و میراتگـر و نوێنەری ئەم کولتوورەیە [٨٠]. لێرەدا مەبەستمان لە کەلتوور سەرجەم ئـەو بەرهـەم و ئەنجامە مێژوویانەیە کە کۆمەڵێکی دیارکراو لە مێژووی خۆیاندا هێناویانەتە بەرهەم لە زمان و بیر و ئەدەب و هونەر و میراتی فۆلکلۆری و بابەتە تیۆری و زانستیەکان و دابونەریت. کەلتوور بەشێکە لە کەسایەتی و ناسنامەیەك کـە کۆمـەڵ بەگشـتیی و مرۆڤەکانی بەتایبەتی خۆیانی لەوی دی پێ جیا دەکەنەوە،

---

(٧٩) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر مێژووی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کوردی، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠ — ٣٣ و ڕەفیق سابیر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣ — ٧٠.

(٨٠) ڕەفیق سابیر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣.

نەتەوەیی کوردیش بە هۆی ئەو کەلتوورەیەوە توانیویەتی بوونی خۆی وەك گرووپێکی ئێتنیکی جیاواز لە تورك و عارەب و فارس، بپارێزێت و ناسیۆنالیزمی خۆی لەسەر بونیاد بنێ.

٢. سیاسەتی ستەمکارانە و ستەمی ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان بە سەردا دابەشکراوە، یەکێکی دیکەیە لەو هۆکارانەی کە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کوردی، بۆ نموونە ئەگەر سەرنجی شۆڕش و ڕاپەڕینە کوردییەکان بدەین ئەم هۆکارەمان بەڕوونی بەرچاو دەکەوێت، بۆیە ئەگەر سەرەتاکانی ناسیۆنالیزمی کوردیش بگێڕینەوە بۆ شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵای نەهری دەتوانین بڵێین ئەو ناسیۆنالیزمە کاردانەوە بووە بە ڕووی بزوتنەوەی ناوەندچێتی و داتەپینی دەسەڵات و چەوساندنەوەی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی [81].

بۆیە لێرەدا ئەم خاڵە کە ستەمکاری بووە بەرامبەر بە گەلی کورد هۆکاری چەکەرەکردنی ناسیۆنالیزمی کورد بووە وەك کاردانەوەیەك بەڕووی ناسیۆنالیزمەکانی دیکەی ناوچەکە .

٣. ڕۆڵی ڕۆژنامەگەری کوردی لە برەودان بە ناسیۆنالیزمی کوردی. دیارە بێگومان ڕۆژنامەگەری ڕۆڵێکی دیاری هەیە لە بڵاوکردنەوە و برەودان بە هەستی نەتەوەیی و بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی تاك و گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگە، ڕوژنامەگەری کوردی سەرەتا لەبەر ئەم مەبەستانە و بۆ تەواوکردنی خەباتی نەتەوەیی سەری هەڵداوە، لەبەر ئەوە ئەگەر سەیری ڕۆژنامەی کوردی بکەین کە لە (٢٢ نیسانی ١٨٩٨) لە لایەن بنەماڵەی بەدرخانییەکان دەرکرا بەناوی (کوردستان) پتر گرینگی بەلایەنی ڕۆشنبیریی و زانست دەدا، دواتر لایەنەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی لەخۆگرت. بەشێوەیەکی گشتیی ڕەوتی ڕۆژنامەگەری کوردی لە پەروەردەکردنی تاك و کولتووری کوردی گرینگی

---

(٨١) ئەبوبەکر عەلی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣١. و ڕەفیق سابیر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣-٤٥.

خۆی هەبووە و دەستی باڵای هەبووە لە بزواندنی بیر و هۆشی نەتەوایەتی کوردی لای تاکی کورد و ڕواندنی هەستی ناسیۆنالیزمی لە ناخی تاکەکان دا.

وەك ئەنجامگیرییەك بۆ ناسیۆنالیزمی کوردی لەژێر ڕۆشنای ئەو باسەی سەرەوەدا و ئەو بارودۆخەی کە ناسیۆنالیزمی کوردی تیایدا سەریهەڵداوە، دەکرێ بڵێین ئەو ناسیۆنالیزمەی کەلای تاکی کوردی هەیە لەسەر سۆز و ئیش دەکات، تاکو ئێستەش دیدێکی مەعریفی قووڵمان نییە بۆ ناسیۆنالیزم، ناسیۆنالیزم نە بۆتە کایە و بابەتێکی هزری و تیۆری وا کە بتوانێت پێوەر بداتە دەست هاووڵاتی و کۆمەڵگە بۆ دادوەریکردن لەبارەی سیاسەت و دروشم و گوتار و نەخشەکان، ناسیۆنالیزمی کوردی لە ڕووی مێژووییەوە تەمەنی لە ناسیۆنالیزمەکانی دیکەی ناوچەکە کەمتر نییە، بەڵام لەبەر سرووشتی کۆمەڵگەی کوردی و دابەشبوونی کوردستان و چەوساندنەوەی نەتەوەیی و بەئاکام نەگەیشتنی بزوتنەوە نەتەوەیەکە و دروستنەکردنی دەوڵەت، و لەبەرچەندین هۆکاری تر ناسیۆنالیزمی کوردی نەیتوانیوە لە هەندێ ڕووەوە ناوەڕۆکی سرووشتی خۆی پەیدا بکات و ئەرکەکانی بە جوانی ڕابپەڕێنێ[٨٢]. بۆیە ناسیۆنالیزمی کوردی لەژێر جەبری کەتوارەکەدا خۆی لە ناسیۆنالیزمێکی ڕزگاریخوازانەدا دەبینێتەوە چونکە داواکاری نەتەوەیی دوورمەودا لە ئامانج لەلایەك و ڕیشەی ئەم ناسیۆنالیزمە لە لایەکی دیکەوە بریتییە لە ڕزگاری و سەربەخۆیی.

لەپاڵ ناسیۆنالیزم فاکتەری دیکەی وەك ئاین و دابونەریت ڕۆڵ و کاریگەرییان هەیە بە سەر کۆمەڵگەوە، بەتایبەتی کۆمەڵگەیەکی وەك کۆمەڵگەی کوردی، بەڵام هەریەکەیان بەڕێژەی جیاواز ئەو کاریگەریە دروست دەکەن، لە توێژینەوەیەکی لەم شێوەیەشدا ناکرێت باس لە کۆی هەموو ئەو لایەنانە بکرێت، بۆیە تەنیا جەختمان لەسەر ناسیۆنالیزم کردۆتەوە.

---

(٨٢) ئەبوبەکر عەلی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٩.

## (٢.١.٣) سیستەمی سیاسی لە هەرێمی کوردستان:

لێرەدا دەمانەوێت تیشکێك بخەینە سەر سیستەمی سیاسی (سیستەمی فەرمانڕەوای) لە هەرێمی کوردستان. بۆ ئەوەی بزانین چ جۆرە سیستەمێك لە هەرێمی کوردستان پێڕەو دەکرێت؟ تاوەکو لەو گۆشەنیگایەوە پێوەندی هاوولاتییان لەگەڵ ئەو دەسەڵاتە شرۆڤە بکەین. دیارە لە هەموو ولاتێکی دنیادا سیستەمێکی حوکمڕانی هەیە کە پێڕەوی لێ دەکرێت، سیستەمی حوکمڕانیش بریتییە لەو ڕیوشوێنەی کە ژیانی سیاسی ولاتی پێ بەڕێوە دەبرێ. لە هەرێمی کوردستانیدا ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدان بێت لە دوای ئەو ڕووداوە یەك لە دوای یەکانەی کە ڕوویان دا، سەرەنجام لە دوای ڕاپەڕینەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١ گەلی کوردستانی باشوور. پارتە سیاسییەکان لە کوردستان هەرهەموو لەسەر ئەوە کۆکبوون سیستەمی دیموکراتی سیستەمی ژیانی کوردستانی ئازاد بێت، بگرە بە درێژای خەباتی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستانیش دیموکراتی هەمیشە بە ئامانج گیراوە و لە بەرنامەکان دا تێکستی لەسەرکراوە [٨٣].

سەرەنجام لە بەرواری ١٩٩٢/٥/١٩ هەڵبژاردنێکی سەرتاسەری لە کوردستان دا ئەنجام درا بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان ـ عێراق. لەگەڵ ڕابەری بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردستان، کە نێزیکەی یەك ملیۆن دەنگدەر بەشدارییان لەم هەڵبژادنەدا کرد، سەرەڕای ئەوەی کە بەهەڵبژاردنێکی سەرکەوتوو لە قەڵەم درا لەگەڵ ئەوەشدا تاقیکردنەوەیەکی دیموکراتی بوو بۆ خەڵکی کوردستان، کە بۆ یەکەمجار بوو لە کوردستان پرۆسەیەکی لەم شێوەیە بەڕێوە بچێ و ئەنجام بدرێ [٨٤]. بەم شێوەیە لەدوای پرۆسەی هەڵبژاردن سەرباری ئەوەی کە بەرئەنجامەکانی ئەم هەڵبژاردنە گرژی و نائارامییەکی خستە

---

(٨٣) ڕزگار محەمد قادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣.

(٨٤) چنار سەعد عەبدوللا، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٩ .

نێو ڕیزی حزبە بەشداربووەکان، بەڵام لە پێناو پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندی نەتەوەیی کورد، هەروەها بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی ڕاپەڕین، لایەنەکان دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر و ئەنجامدانی چەندین کۆبوونەوە ڕازیبوون بە بە پەرلەمانێکی پەنجا بە پەنجا.

بەم جۆرە پەرلەمانی کوردستان دوای هەڵبژاردن یەکەم دانیشتنی خۆی لە (١٤ی حوزەیرانی ١٩٩٢) گرێدا، و پاش مانگێکی تەواو دەستەی ئەنجومەنی وەزیرانی کوردستان پێك هێنرا و حکوومەت هەڵبژێردراو دەستی بەکارەکانی خۆی کرد [٨٥].

بەم شێوەیە هەرێمی کوردستان یەکەیەکی سیاسیی دامەزراند کە خاوەن ڕەوایەتی بوو لەبەرئەوەی لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆی خەڵکی کوردستانەوە هەڵبژێردرا.

ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە سیستەمی فەرمانڕەوای (سیستەمی سیاسی) لە کوردستان بریتییە لە سیستەمی پەرلەمانی وەك لە مادەی یەکەم لە بنەما سەرەکییەکان لە (پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان ـ عێراق) دا هاتووە کە دەڵێ: (کوردستان ـ عێراق هەرێمێکە لە نێوان دەوڵەتی عێراقی فیدراڵیدا، سیستەمە سیاسییەکەی پەرلەمانی، کۆماری و دیموکراتییە و پشت بە فرەلایەنی سیاسی و بنەمای لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و دەستاو دەستکردنی ئاشتیخوازانەی دەسەڵات لە ڕێگەی هەڵبژاردنێکی گشتیی ڕاستەوخۆی نهێنی و دەورییەوە دەبەستێ) [٨٦]. پاش باسکردنی سیستەمی سیاسی لە هەرێمی کوردستان، دەمانەوێت تیشکێك بخەینە سەر پێوەندیی نێوان هاووڵاتی و دەسەڵات لە کوردستان، هەوڵ دەدەین ڕێچکە و ڕێبازێکی زانستی و ئەکادیمی بگرین لە دوو لایەنەوە باسی بکەین، پێوەندیی یاسایی نێوان هاووڵاتی و دەسەڵات لە لایەك و پێوەندی سیاسی نێوان هاووڵاتی و دەسەڵات لە لایەکی دیکەوە.

---

(٨٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨١ .

(٨٦) وەرگیراوە لە: پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان، پەرلەمانی کوردستانی ـ عێراق، لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بەم ناونیشانە: http:// www.perleman.org ٢٠١٠/٤/٣ .

**(١٢.١.٣) پێوەندی یاسای نێوان هاووڵاتی و دەسەڵات لە کوردستان:**

لە دیارکردنی پێوەندیی یاسایی نێوان هاووڵاتی و دەسەڵات لە کوردستان دا دەمانەوێت لە ڕێگەیەکی دەستوورییەوە لە بابەتەکە بدوێین کە تیایدا هاووڵاتی بە حکوومەت و دەسەڵات دەبەسترێتەوە لە ڕێگەی دیارکردنی ماف و ئەرکەکان کە لە دەستووردا هاتووە .

دەروازەی دووەم لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان باس لە مافە سەرەکییەکان دەکات پێکهاتووە لە ٢١ مادە، (مادە ١٨ تا ٣٨) و دابەشکراوە بەسەر چوار بەشدا، لە بەشی یەکەم دا باس لە مافە مافە شارستانی و سیاسییەکان کراوە لە (مادە ١٨ تا ٢٢) کە تیایدا هاتووە دەبێ شکۆمەندی تاکەکانی نێو ئەم هەرێمە پارێزراو بێت و لە هەمانکاتدا هەموو کەس مافی ژیان و ئازادی هەیە و هیچ کەسێك ناتوانێ لێی بێبەش بکات یان لێی بەر تەسك بکاتەوە، هەموو کەس مافی ئازادی کۆبوونەوە و پێکهێنانی کۆمەڵە و یەکێتیەکانی هەیە و تاکەکان ئازادن لە بەشداریکردن و بوون بە ئەندام لە ڕێکخراو و پارتە سیاسییەکان، هەروەها لە مادە ٢٠ دا هاتووە کە هەموو کەس بەرامبەر یاسا یەکسانە و هەموو چەشنە جیاکارییەك لەسەر بناخەی نەژاد، ڕەنگ، ڕەگەز، زمان، ئاین، و ... هتد قەدەخەیە.

لە بەشی دووەمی هەمان دەروازەدا باس لە مافە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکان دەکات لە مادە ٢٣ تا ٢٨ کە تیایدا هاتووە کە هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە ئاستێکی گوزەرانی بەرز و تەواوی هەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت بە سەربەرزانە بژی، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کەس مافی بیمەی کۆمەڵایەتی هەیە بەبێ جیاوازی.

بەشی سێیەم لە دەروازەی دووەم لە (مافە سەرەکییەکان)ی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان، تەرخانکراوە بۆ مافە نەتەوەیی و ئاینییەکانی پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی هەرێمی کوردستان ـ عێراق کە لە (مادە ٢٩ تا٣٦) دەگرێتەوە جەختکراوەتەوە لەوەی کە هەموو ئەو کەسانەی سەر بەیەکێك لە پێکهاتە نەتەوەیی و ئاینییەکانن مافی ئەوەیان هەیە بەناوی خۆیانەوە بە فەرمی بناسرێن، سەوداییان لەگەڵ بکرێت، هەروەها دەسەڵاتەکانی هەرێمی کوردستان دەبێ بنەمای یەکسانی کارا دەستەبەر بکات و کاربکەن بۆ بەدیهێنانیان لە نێوان

خەڵكانی سەر بە پێكهاتە نەتەوەیی و ئاینە جیاوازەكان، كەشێكی پێكـەوەژیانی ئاشـتییانە فەراهەم بكەن. هەرچی بەشی چوارەمی ئەم دەروازەشە تایبەتكراوە بۆ ڕێكەوتن و پەیماننامە و یاسا نێودەوڵەتییەكان كە (مادەی ٣٧و٣٨) لەخۆدەگرێت، تیایدا هاتووە كە هەر كەسـێك مافی خۆیـەتی كـەڵك لـەو مافانـەش وەربگرێـت كـە لـە ڕێككەوتننامـە و پەیماننامـە و بەڵێننامە و جاڕنامە نێودەوڵەتییەكانی پێوەندیدار بە مافی مرۆڤەوە هـاتوون)[٨٧] ئەمانـەی كە لەسەرەوە ئاماژەمان پێـدا بـریتی بـوون لـەو مـادە دەسـتوورییانەی كـە لـە (پـرۆژەی دەستووری هـەرێمی كوردسـتان ــ عـێراق) دا هـاتووە سـەبارەت بـە مـاف و ئەركـەكانی هاووڵاتییان لە هەرێمی كوردستان و ڕێكخستنی پێوەندییە یاسایەكانی نێوان هاووڵاتییـان و دەسەڵات لە كوردستان.

### (٢.٢.١.٣) پێوەندی سیاسی نێوان هاووڵاتی و دەسەڵات لە كوردستان

لەنێو ئـەم پێوەندییـە سیاسـییەدا بەشـداری سیاسـیمان هەڵبـژاردووە، كـە باسـی لێوەبكەین، چونكە لە ڕێگەی بەشـداریكردنی سیاسـی هاووڵاتییانـەوە بـە هـەموو شێوازە جۆربەجۆرەكانیەوە ئەم پێوەندییە سیاسییە لە نێـوان هـاووڵاتی و دەسـەڵاتدا دێتەبوون، بۆیە هەوڵمان داوە وەڵامی ئەم پرسیارانە بخەینـە ڕوو. بەشـداری سیاسـی چییە؟ ئاستەكانی بەشداری سیاسی چییە؟ كەناڵەكانی بەشداری سیاسـی كامانـەن؟. پاشان تیشكێك دەخەینە سەر ئەم پێوەندییە (پێوەنـدی سیاسـی نێـوان هـاووڵاتی و دەسەڵات) لە كوردستان .
تـوخمی بەشداریكردن بەشێكی هەرە گرینگـی پرۆسـەی دیموكراتییـە بـە هـەموو واتاكانیـەوە لـە هەمانكاتـدا توخمێكـە لـە توخمـەكانی هـاووڵاتیبوون (مـافی

(٨٧) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم بابەتە و ڕوونكردنەوەی زیاتر لەبارەیەوە، بڕوانە: پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان ـ عێراق، بەگشتی و دەروازەی دووەم (مافە سەرەكییەكان) بەتایبەتی، ل ١٢ تا ٢٧.

هاوولاتی)، لە گەڵ ئەوەشدا پێوەندییەکانی بەشداری سیاسی بە دیموکراتییەوە پێوەندییەکی بەڵگەنەویستە، چونکە دیموکراتی بەجۆرێك لە جۆرەکان واتای هەمەلایەن دەگەیەنێ کە بە ئەندامانی کۆمەڵ دەدرێت تاوەکو بە ئازادی بەشداری بکەن لەو بریارانەی کە پێوەستن بەبوارەکان ژیانیان، ئامانجی هەرە گەورەی کۆمەڵگەی دیموکراتی ئەوەیە بەشداری هاوولاتییان لە پرۆسەی سیاسی ولات فروان بکات، بەهۆی ئەمەشەوە کۆنترۆڵی میللی و جەماوەری بۆ فەرمانڕوا سیاسییەکان زیاتر دەکات، هەر ئەوەشە جیاوازی نێوان هەرە گەورەی نێوان کۆمەڵگەی دیکتاتۆری و کۆمەڵگەی دیموکراتی (٨٨).

لێرەدا دەبینین پێوەندییەکی دوولایەنە هەیە لە نێوان دیموکراتی و بەشداری هاوولاتیان، بە جۆرێك سیستەمی دیموکرات ڕێگە خۆش دەکات کە تاکەکان بەشداری کارایان هەبێت لە کۆی گشتیی پرسە جۆربەجۆرەکان، لە لایەکی دیکەیشەوە بەشداری زیاتری هاوولاتییان و بەدەمەوەهاتنی هاوولاتیان بۆ پرسە هەنوکەیەکان سیماکانی دیموکراتی قووڵتر دەکات، پاشان ئەگەر باسێك لە خودی بەشداری سیاسی بکەین، دەبینین شیکردنەوەی زۆری بۆکراوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتیی بەشداری سیاسی (واتای ئەو پرۆسەیەیە کە تاك لە ڕێگەیەوە ڕۆڵی دەبێت لە ژیانی سیاسی کۆمەڵگەکەی و چانسێکی بۆ هەڵدەکەوێ تاکو بەشداری لە گفتوگۆی ئامانجە گشتیەکانی کۆمەڵگەکەی بکات و باشترین ڕێگە بۆ جێبەجێکردنیان دیاری بکات) (٨٩). هەر یەکە لە "سامویل هانتنگتۆن و نیلسۆن" بەم شێوەیە پێناسەی بەشداری سیاسی دەکەن (ئەو چالاکییەیە کەوا کۆمەڵێك هاوولاتی دیاری کراو ئەنجامی دەدەن بە مەبەستی کاریگەری دانان لەسەر پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری

---

(٨٨) ڕزگار محەمد قادر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٤٢.

(٨٩) عوسمان عەلی حەسن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٨ – ٩٩.

حوكميدا) [٩٠]. لێرەدا بۆمان دەردەكەوێت كە بەشداری سیاسی گرینگییەكەی لە ڕادەی ئەو كاریگەرییەوە خۆی دەبینێتەوە كە هەیەتی بۆ سەر ژیانی سیاسی وڵات.

بەشداری سیاسی زۆر و كەم لە هەموو كۆمەڵگەكاندا بەرچاو دەكەوێت، بەڵام و شێوەی ئەم بەشداریكردنە لە هەموو كۆمەڵگەكاندا وەك یەك نییە، هەموو تاكەكان وەك پێویست خەریكی چالاكی سیاسی نین و بەشداری هاووڵاتیان لە كاروباری سیاسییدا نابەرامبەرە و كاریگەری تاكەكان و گرووپەكانیش لە پرۆسەی واقعی بڕیاردانی سیاسییدا جیاوازە.

**ئاستەكانی بەشداری سیاسی:** ئاستەكانی بەشداری سیاسی لە چەند شێوەیەكی سەرەكیدا خۆی دەبینێتەوە كە لە دەوڵەتێكەوە بۆ دەوڵەتێكی دی و لە كاتێكەوە بۆ كاتێكی دیكە جیاوازە، كە بەشێوەیەكی گشتیی بارودۆخ و ڕادەی بەشداری سیاسی و خولیای هاووڵاتی بۆ بەشداری لە كاری گشتیی، كاری تێدەكات.

**ئاستی یەكەم : ئاستی بەرزی بەشداریكردن (ئەوانەی پۆستی سیاسی بەڕێوەدەبەن):** ئەو كەسانە دەگرێتەوە كە پرۆسەی وەرگرتنی بڕیاری سیاسییان بە دەستە و كار لە ژیانی كۆمەڵگە و پێوەندییەكانی دەرەوەیان دەكەن، ئەم ئاستە ئەوانە دەگرێتەوە كە هەندێ لەم مەرجانەی تیادایە وەك (ئەندامێتی لە پارتێكی سیاسی، خۆبەخشی بۆ ڕێكخراوێك یان پاڵێوراوێك، ئامادە و بەشداری لە كۆبوونەوە سیاسییەكان بە بەردەوامی، بەشداری لە هەڵمەتەكانی هەڵبژاردن و... هتد)

**ئاستی دووەم: ئەوانەی گرینگی و بایەخ بە چالاكییە سیاسییەكان دەدەن:** ئەوانە دەگرێتەوە كە بەشێوەیەكی گشتیی بایەخ دەدەن بە هەموو ئەو ڕووداوانەی كە لە

---

(٩٠) ڕابەر تەلعەت، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١.

گۆڕەپانی سیاسییدا ڕوودەدات و بەدواداچوونی بۆ دەکەن، وەك بەشداری لە دەنگدان لە کاتی پرۆسەی هەڵبژاردن.

**ئاستی سێ یەم : خۆپارێزەکان لە کاری سیاسی:** هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە لە کاری سیاسییدا خۆیان دەپارێزن و گرینگی بەکاری سیاسی نادەن و هیچ مەیلێکیان نییە بۆ پرۆسە سیاسییەکان و هیچ کات و داهاتێکیش بۆ ئەم مەبەستە تەرخان ناکەن ئەگەرچی لەوانەیە هەندێکیان بەشێوەیەك لە شێوەکان ناچار بن لە کاتی تەنگژەکان یان هەستکردن بەوەی بەرژەوەندییەکانیان هەڕەشە و مەترسی لەسەرە بەژداری بکەن لە پرۆسە سیاسییەکان لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر.

**ئاستی چوارەم: توندڕۆییە سیاسییەکان:** ئەوانەی لە دەرەوەی چوارچێوەی کاری ڕەوادا کار دەکەن و پەنا دەبەنەبەر شێوازی توندوتیژی، هەموو ئەمانە هەستێکی دوژمنکارانەیان بەرامبەر کۆمەڵگە بە شێوەیەکی گشتیی و بەرامبەر بە سیستەمی سیاسی بە شێوەیەکی تایبەتی هەیە، ئەمانەش زیاتر لە دوو بەش پێك دێن بەشێکیان هیچ گوێ بە پرۆسەی سیاسی نادەن و دەچنە خانەی گرووپە پەراوێزبووەکان، بەشەکەی دیکەش بەشداری دەکەن لەسەر بنەمای توندوتیژی، هەموو جۆرە ڕێگەیەکی توند و تیژی دەگرنەبەر لە دژی سیتەمی سیاسی [(٩١)].

بە شێوەیەکی گشتیی ئاستەکانی بەشداری سیاسی خۆی لەم چوار ئاستەدا دەبینێتەوە کە ئاماژەمان پێدا.

**ڕێگە و کەناڵەکانی بەشداری سیاسی:** سەبارەت بە کەناڵەکانی بەشداری سیاسی دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە دابەشی بکەین:

---

(٩١) د.السید علیوە و د. منی محمود، المشارکە السیاسیە، منشور علی الانترنیت فی الموقع التالی : http:// www.dctcrs.org ، ٢٠١٠/٤/٣.

**١. بەشداری لــە ڕێگــەی دامودەزگــە و دامــەزراوە فەرمیــەکان :** مەبەســت لــەم بەشداریکردنە، ئەوەیە کە تاك ڕۆڵ و پلە و پایەی کــارگێڕی و بیرۆکراســی جیاجیــای دەبێت لەنێو دامو دەزگەکانی حکوومەت و دەوڵەت دا.

**٢. بەشداریکردن لە ڕێگەی حزبە سیاسییەکان:** حزب وەك ڕێکخراوێکــی سیاســی و کۆمەڵایەتی ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕێت لە دروستکردنی پێوەندیی لە نێوان دەســەڵات و ئەو هاووڵاتییانەی کە خوازیاری بەشداریکردنن لە سیاسەتدا.

٣. **بەشداریکردن لە ڕێگەی کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی:** ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی، یەکێك لە ئەرکەکانیان ئەوەیە کە ببنە مایەی چێکردنی پردی گفتوگۆ لە نێوان دەسەڵات و هاووڵاتیاندا، لێرەشەوە دەرگەیەك دەکاتەوە بەڕووی تاکەکانی کۆمەڵگەدا بۆ بەشداریکردن لە کایە جۆربەجۆرەکان.

**١. بەشداریکردن لە ڕێگەی دەنگدان لە کاتی هەڵبژاردن:** ئەم جۆرە بەشــداریکردنە نزمترین ئاستی بەشداری تاکەکانە لە ژیانی سیاسی کۆمەڵگە دا، کــە لــە ڕێگــەی چوونە سەر سندووقەکانی دەنگدانەوە دەبێت لە ماوەی چەند ساڵێکدا.

**٢. بەشداریکردن لە ڕێگەی ڕاپرسی:** ئەمەش جۆرێکە لە بەشــداریکردنی سیاســی، کــە سیستەمە دیموکراتییەکان پێڕەوی دەکەن، بەر لە دەرکردن و جێبەجێکردنی یاســایەك یــان دەرکردنی بڕیارێکی چارەنووسساز، بیروڕای خەڵکی وەردەگرن.

**٣. بەشداریکردن لە ڕێگەی گرووپەکانی پاڵەپەستۆ:** یەکێکی دیکە لــە ڕێگــەکانی بەشداریکردن، کە هاووڵاتییان دوای ئــەوەی کــە هیوایــان بــە کەناڵــە فەرمییــەکان نامێنێت تا لــە ڕێگەیــەوە بــە ئامــانج و خواســتەکانیان بگــەن، پــەنا دەبەنــە بــەر

دروستکردنی گرووپی جیاجیای فشار، تا لەو ڕێگەیەوە زۆر بۆ حکوومــەت و لایەنــە فەرمییەکان بهێنن تا بەدەنگ خواستەکانیانەوە بچن [٩٢].

لەژێر ڕۆشنایی ئەو باسەی سەرەوەدا، ئەگەر تیشکێك بخەینە سەر بەشداری سیاســی لای تاکی کورد لە کۆمەڵگەی کوردیدا تێبینی ئەوە دەکەین، بەشــداری هاووڵاتیــان بۆ پرسە سیاسییەکان لە ئاستێکی بەرز و پێویستدا نییــە، هەرچــەندە لــە دەروازەی دووەمی تۆژینەوەکەمان کە تایبەتەبەلایەنی مەیدانی زیاتر ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، بەشداری سیاسی لای تاکی کورد دەتوانین بڵێین لە ئاستی دووەم و ئاســتی سێیەمدا ، کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێداوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەشداری کردنەکەیشــیان زیاتر لە ڕێگەی ئەم دوو کەناڵەوەیە.

**یەکەم**، بەشداریکردن لــە ڕێگــەی حزبــە سیاســییەکان، بــەو پێیــەی کــە حــزب لــە کۆمەڵگــەی کــوردی دا لــە زۆرینــەی بوارەکــانی ژیــانی تاکەکانــدا بــوونی هەیــە و کاریگەری خۆی بە جێ دەهێڵێ لەسەریان، و پانتاییەکی فرەوانیان داگیرکردوە.

**دووەم**، بەشداریکردن لە ڕێگــەی دەنگــدان لــە کــاتی هەڵبــژاردن. کــە ئەمــەش ئاستێکی نزمی بەشداریکردنە، زۆرینەی تاکی کورد لــە کــاتی هەڵبژادنەکانــدا پراکتیزەی ئەم دۆخەکە دەکەن.

## (٢.٣) کورد و ڕۆشنبیریی سیاسی:

دیارە بێگومان ئەگەر لە ولاتانی ڕۆژئــاوا بەگشــتیی و لــە ولاتێکــی وەك فەرەنســادا بــە تایبــەتی ســەرهەڵدان و دروســتبونی ڕۆشــنبیریی بــە لایەنــە جۆربەجۆرەکانییــەوە وەکــو

(٩٢) ڕابەر تەڵعەت، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٧ — ٦٨ و د.ئیبراهیم ئیبرای، ئاست و شێوەکانی بەشداری سیاسیی، و: حیکمەت نامیق، گۆڤاری تۆژینەوە، لە لایەن (بنکەی تۆژینەوە) لە (دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی) دەردەچێت، هەولێر، ژمارە(٢)، ساڵی یەکەم، حوزەیرانی ٢٠٠٥، ل ٧٥-٧٩.

کێڵگەیەکی ئۆتۆنۆمی ڕۆشنبیران و هاوولاتییان بگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەهەم، ئەوە دەتوانیین بلێین تا ئێستە کە سەدەی بیست و یەکە لە کوردستان دا، ڕۆشنبیریی بە هەموو لایەنەکانیەوە و لە نێوانیشیان دا ڕۆشنبیریی سیاسی، وەك کێڵگەیەکی سەربەخۆ و گەشەسەندو کە تۆوی سەرهەڵدانی تێدا چەکەرە بکات لەنێو پرۆسێسی بیناکردندایە و ئێستەشی لە گەڵدا بێت چوارچێوەکانی ئەم کێڵگەیە، فۆرمەکانی، ستراتیژیەکانی، سیستەمی بنیاتنانی، بەتەواوی دانەمەزراوە [٩٣]، بەڵام ئەمەش واتای ئەوە ناگەیەنێت کە لە کوردستان دا ڕۆشنبیر وەك ئەکتەرێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی، ڕۆشنبیریی وەك ڕووبەرێکی فرەوانی پێگە جیاوازەکان بوونیان نەبووە، لە ئێستەشدا بوونیان نییە، بگرە بە پێچەوانەوە لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە تا ئێستە بەهۆی بەرفرەوانکردنی مەیدانی خوێندن و قوتابخانەکان، کردنەوە و گەشەکردنی زانکۆکان، کۆچکردن لە لادێوە بۆ شار، کۆچکردن لە نیشتمانەوە بۆ ڕۆژئاوا، سەرهەڵدانی چاپخانە و دەزگەکانی چاپ و بڵاوکردنەوە و بە دەیان هۆکاری دیکەش بەشداری ڕاستەوخۆیان لە بیناکردنی ڕۆشنبیریی وەك ڕوبەربەری بەرهەمهێنانی مەعریفە جیاوازەکان و ڕۆشنبیر وەك ئەکتەرێکی خاوەن زانست دا کردووە [٩٤].

هاوکاتیش لە هیچ شوێنێکی ئەم جیهانەدا، ڕۆشنبیرییەکی بێ تەنگژە نییە، ڕۆشنبیرییەکی بێ قەیران مردووە، چونکە ئەوە قەیرانە ناچارمان دەکات بهزرین

---

(٩٣) عادل باخەوان، ڕۆشنبیری سیاسیی و سیاسەتی ڕۆشنبیر، گۆڤاری ڕەهەند، گۆڤارێکی مانگانەی تیۆری کولتوورییە، چاپخانەی کاردۆ، سلێمانی، ژمارە(٢)، ٢٠١٠، ل ١٨.

(٩٤) هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

(بیربکەینەوە) و بجولێین، بۆ ئەوەی ئاسۆ تازەکان بدۆزینەوە. [٩٥] تاوەکو لە ڕێگەی بیرکردنەوەکانمانەوە پەی بە ڕاستییەکان بەرین.

ڕۆشنبیریی کوردیش بەدەر نییە لە کەموکوڕی و قەیران، یەکێك لەو گرفتە ڕۆژانەییانەی ڕووبەڕووی ڕۆشنبیریی کوردی دەبێتەوە برێتییە لە بەرجەستەکردن و تێکەڵکردنی چەمك و پێناسە هزرییە باوە جیهانییەکان (ڕۆژئاواییەکان) لەگەڵ کەتواری کولتووری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردیدا، کە حاڵەتێکە دەکرێ لێیەوە سستبوونی ڕۆشنبیریی کوردی ببینین [٩٦] هەڵبەتە ئەم دیاردەیەش کێشەیەکی بەرچاوە لە پانتایی ئەمڕۆی ڕۆشنبیریی کوردی دا بە تایبەتی لە دوای ڕاپەڕین، و کرانەوەی زیاتری کۆمەڵگەکان بە ڕووی سیستەمی نوێی جیهانی دا و لەژێر سایەی گڵۆبالیزەیشن، ئەم گرفتەی کە باسمان لێوەکرد لەناو پانتایی ڕۆشنبیریی کوردی دا ئامادەیی هەیە و زیاتر بووە، بەجۆرێك سەرتاپای نووسینەکانمان بە کتێب و گۆڤار و بڵاوکراوە ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان، بگرە زمانحاڵی حزبەکانیش بەو "چەمك و پێناسە هزرییە باوە جیهانییانە"بارگاویکراون.

دیارە کۆپیکردنی هەمان ئەو هزرە و ئایدیایانەش بۆ کۆمەڵگەیەکی وەك کۆمەڵگەی کوردی کارێکی نەك هەر تەندروست نییە، بگرە قەیرانیشی لێ دەکەوێتەوە. بۆیە دەبینین ڕۆشنبیریی کوردی زادەی هەڵقوڵاوی ڕاستەقینەی کۆمەڵگەکەی خۆی نییە و لەژێرکاریگەری کولتووری کۆمەڵگەکانی ناوچەکە لەلایەك و کولتووری ڕۆژئاوا لەلایەکی دیکەوە، بۆیە ئێمە تەنیا لەژێر دۆخی ژێردەستەی و دابەشبوونی سیاسی و جوگرافیدا ناژین، بگرە لە دۆخی لێکدابڕان و دابەشبوونی کولتوورریشدا دەژین [٩٧].

---

(٩٥) هەندرێن، خامەیەکی ڕۆشنبیری لە پشت گوێی زمان، چاپی یەکەم، وەزارەتی ڕۆشنبیری – بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ١٦٧.

(٩٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧١.

(٩٧) ڕەفیق سابیر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦.

وەکو بەرئەنجامێك بۆ ئەم تێڕوانینەی سەرەوە پەی بەو ڕاستییە دەبەین کە"مرۆڤی کورد پێش هەر شتێك بەرهەمی ئەو کولتوورەیە کە لە ناوچەکەدایە یان لە بەشە کوردستانەکەیدا، هێنراوەتە بەرهەم و بە سیستەمی کولتووریی ناوچەکەیەوە بەستراوەتەوە" (٩٨).

پاشان ئەگەر تیشکێك بخەینە سەر پرۆسەی پێگەیاندنی سیاسی لە کوردستاندا، کە لەم ڕێگەیەوە زیاتر ڕۆشنبیریی سیاسی بڵاودەبێتەوە، دەبینین لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا بەتایبەت لەدوای نەوەدەکانەوە لە کوردستان، بە دۆخێکی دژوار و پڕ لە ناکۆکی و لێ کدژی دا تێپەڕبووە، شەڕی ناوەخۆ لەگەڵ ئەوەی زیانێکی دارایی و مرۆیی زۆری لێ کەوتەوە دەسەڵات و ئیدارەی لە کوردستان دابەشکردو بەرئەنجامێکی ترسناکیشی لێکەوتەوە وەك دابەشکردنی دەزگە پەروەردەیی و زانستی و ئەکادیمیەکان، لەنێو ئەو کەشوهەوا سیاسییەی کە لە کوردستان دا دروست ببوو بە هەموو لایەکەوە تاکی کوردیان ناچارکرد، تاکو بەنێو پرۆسەیەکی پێگەیاندنی سیاسی تەواو دژ و ناکۆك دا گوزەر بکات، کە ئەو تاکە بە زەحمەت بتوانێت بەها و ئەرزشە نەتەوەیی و حزبیەکان لێکدی جودا بکاتەوە و ببێت بە خاوەنی هۆشیاری و ڕۆشنبیرییەکی سیاسی ئەوتۆ کە خۆی بتوانێت ئاراستەی سیاسی و ئایدیۆلۆژیەکانی خۆی دەستنیشان بکات (٩٩).

ئەو بارودۆخەی کە کوردستان ساڵانێك پێیدا تێپەڕی، لەگەڵ خۆیدا ترس و نیگەرانییەکی لە ناخی تاکەکاندا دروستکرد بەرامبەر بە حزبایەتی و دوور کەوتنەوە لە سیاسەت و پەراوێزخستن و گلەیی و گازندەی بەردەوام لە حزب و دەسەڵات

---

(٩٨) هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

(٩٩) ڕابەر تەڵعەت، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٤.

کەنارگیری و خۆگرتن لەژیانی سیاسیشدا، لەنێو هەموو گرووپە کۆمەڵایەتیەکاندا ، لە بارو دۆخێکی تایبەتدا دروست دەبێت، ئەم بارودۆخەش هەروەکو باسمانکرد لە کاتی شەڕ و ئاژاوە و ناسەقامگیری سیاسی و کۆمەڵایەتی دا دێتە ئاراوە [١٠٠].

بۆیە دەبینین لە پێش ڕاپەڕین کۆمەڵێك پارتی سیاسی لە کوردستان دا هەبوو، دوای ڕاپەڕینیش ئەو پارتە سیاسیانە هاتنەوە ناو شارەکان و کاری سیاسیان لە کاری نهێنییەوە بۆ کاری ئاشکرایانە گۆڕا، لەگەڵ ئەوەشدا چەند پارتێکی سیاسی دیکە دروست بوون، بەڵام ئەوەی وایکرد ئەو پارتە سیاسیانەی کوردستان نەتوانن ئەو ڕۆڵە بگێڕن کە لە سایەی دیموکراتیدا لە پارتە سیاسییەکان چاوەڕوان دەکرێت، نەبوون یان لاوازی ئەو دوو مەرجە سەرەکییەیە، کە دەبێت لە پارتە سیاسییەکاندا بوونی هەبێت

**یەکەم:** باوەڕبوون بەدیموکراتی وەکو سیستەمی فەرمانڕەوایی لە کوردستان.

**دووەم:** پێڕەوکردنی دیموکراتی لە ژیانی ناوخۆی حزبدا [١٠١]، کە ئەمەش کاریگەری لەسەر ژیانی سیاسی ئەم هەرێمە و تەنانەت ڕەنگدانەوەی لەسەر جەماوەری کوردستانیش هەبوو، ئەویش بە سازدان و پەروەردەکردن و ئامادەکردنیان لەسەر هەمان جۆری بیرکردنەوە کە لە ناخی پارتە سیاسییەکانی کوردستان دا چەکەرەیان کردبوو.

پێویستە هەر کەسێك لە بواری سیاسییدا کار بکات دەبێت پاشخانێکی ڕۆشنبیریی لەو بوارەدا هەبێت، ناگونجێت کەسی بێئاگا لە ڕۆشنبیریی سیاسی و هزری سیاسی و زانستی سیاسی، بتوانێت کاری سیاسی بکات، بۆیە ڕەنگە یەکێك لە کێشە سەرەکییەکانی سیاسەتکردن لە کۆمەڵگەیەکی وەکو کوردستان دا نەبوون یان لاوازی

---

(١٠٠) رابەر تەڵعەت، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥.

(١٠١) رزگار محەمەد قادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣١ .

ئەو پاشخان و ڕۆشنبیرییە سیاسییە بێت دووچاری ئەو کەسانە بۆتەوە کە بەکاری سیاسییەوە سەرقاڵن [١٠٢].

هەروەها لاوازی دامودەزگەکانی کۆمەڵگەی شارستانی لە کوردستاندا و سستی ئەدای ئەم کۆمەڵە و ڕێکخراوانە و لەپاڵ ئەویشدا لاوازی دامودەزگە پەروەردەی و ئەکادیمیەکان لە ڕووی بەرنامە و پرۆگرامی زانستییەوە، بۆشاییەکی گەورەی ناوەتەوە لە ڕۆڵی ئەم دامودەزگەیانەدا لە پرۆسەی پێگەیاندنی سیاسی [١٠٣].

لە میانەی ئەو شرۆڤەییەی کە لەبارەی ڕەوشی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کوردستان کردمان دەتوانین بڵێین ئەو هۆشیاری و مەعریفە سیاسییەی کە لای تاکی کورد هەیە بەرهەمی ئەو ژینگەیەیە کە لەم هەرێمەدا خولقاوە، کە چەندین هۆکار دەستیان لە بەدیهێنانیدا هەبووە وەك لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، کە بێگومان ئەو ڕۆشنبیرییەش لە ئاستێکی بەرز و پێویستدا نییە.

(١٠٢) عەتا قەرەداخی، کورد و ڕۆشنبیری سیاسیی، گۆڤاری لڤین، سلێمانی، ساڵی هەشتەم، ٢٠١٠/١/٢٠، ژمارە (١١٥)، ل ٨.

(١٠٣) ڕابەر تەڵعەت، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣.

# دەروازەی دووەم : لایەنی مەیدانی

## دەستپێك

دیاره بێگومان هەر لە کاتی دەستنیشانکردنی بابەتی تۆژینەوە لەسەر لێتۆژ وا پێویست دەکات هەموو هەنگاوەکان لە سەرەتاوە تاکو دوا هەنگاو دیار بکات و لە بەر چاوبگرێت بۆ سەرکەوتنی تۆژینەوەکەی، لەو کاتەی کە بابەتێکی هەستیاری وەك ڕۆشنبیریی سیاسی تۆژینەوەی لەسەر دەکرێت پێویستیی بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی مەیدانی دەبێت، لەبەرئەوەی تەنیا سەرچاوە نووسراوەکان بەس نییە، بۆ باسکردن و زانینی ڕۆشنبیریی سیاسی، چونکە ڕۆشنبیریی سیاسی پێوەندییەکی توندوتۆڵی هەیە بە ژیانی هاووڵاتییانەوە بۆیە ئاستی ڕۆشنبیریی سیاسی لەلای تاکەکان لەلایەك و ڕۆشنبیریی سیاسی لە هەموو کۆمەڵگەکان لەلایەکی دیکەوە وەك یەك نییە و جیاوازە، تاکو بتوانی نموونەی لێکۆڵینەوەیەکی دیاری کراوی وەکو (تابریل ئەلمۆند یان د.کمال ئەلمەنۆفی) وەکو سەرچاوەی سەرەکیی وەربگریت و لەسەر کۆمەڵگەی کوردی جێبەجێی بکەی، بۆیە لە میانەی تۆژینەوەکەمان بە پێویستمان زانیوە بەشێکی لێ تەرخان بکەین بۆ لایەنی مەیدانی سەبارەت بە ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردی دا. سەرەڕای گرفت و گرانی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی مەیدانی، لەکۆی دابەشکردنی (٢٨٠) فۆرم بەسەر نموونەی لێکۆڵینەوەکەدا (٢٦٠) فۆرم بە شێوەیەکی دروست گەڕاونەتەوە، لە بەرامبەردا (٢٠) فۆرم بە پووچەڵ و نەگەڕاوە لە قەڵەم دراون.

## (١) ئامادەکارییەکانی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکە

### (١ ـ ١) کۆمەڵگەی لێکۆڵینەوە و نموونەی تۆژینەوە:

دیارکردنی نموونەی لێکۆڵینەوە بەیەکێك لە کارە هەرە گرینگەکانی تۆژینەوەی مەیدانی دادەنرێت کە بەرئەنجامی سەرکەوتن و هەرەسهێنانی لێکۆڵینەوەکەی لەسەر بەندە، نموونەی هەڵبژێردراو (نموونەی لێکۆڵینەوە)، واتە هەڵبژاردنی ڕێژەیەکی دیارکراو لە تاکەکانی نێو کۆمەڵگە، کە ئەم ڕێژە دیارکراوەش نوێنەرایەتی کۆمەڵگە دەکات بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان، هەر لەبەرئەوەش ئێمە هەوڵمانداوەکە نموونەیەکی هەڕەمەکی دەستنیشان بکەین لە قوتابیان و فەرمانبەران و پیشە جۆربەجۆرەکانی دیکە بە ڕەگەز و تەمەنە جیاوازەکانەوە، هەروەها وەرگرتنی نموونەکە لە جۆری نموونەی قەبارە بچووکە کە پێکهاتووە لە (٢٦٠) یەکە.

### (١ — ٢) گریمانەکانی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکە:

لەم لێکۆڵینەوەیەدا چەند گریمانەیەکمان خستۆتەڕوو تاکو لەڕێگەی ئەم لێکۆڵینەوە مەیدانییەوە بگەینە بەرئەنجامی ئەم گریواتانە و هەوڵدان بۆ سەلماندنیان.

١ـ بەشداری و هاوکاری هاووڵاتییان لەگەڵ ڕێکخراوەکان و کارکردن لەگەڵیاندا لە ئاستێکی بەرز و پێویستدانیە.

٢ـ بەو پێیەی کە حزب لە کۆمەڵگەی کوردی دا لە زۆرینەی بوارەکانی ژیانی تاکەکاندا بوونی هەیە و کاریگەری خۆی بە جێ دەهێڵێ لەسەریان، لێرەدا گریمانەی

ئەوە دەکەین کەوا هاووڵاتییان تاڕادەیەکی باش وابەستەبوونیان بۆ حزبێك یاخوود لایەنێکی سیاسی هەیە.

٣ـ پرەنسیبەکانی دیموکراتی لە هەرێمی کوردستان دا لە ڕەوشێکی سەرکەوتوودایە.

٤ـ ڕۆشنبیران ڕۆڵێکی بەرچاوو کاریگەر دەگێڕن لە گەشەدان و بەرجەستەکردنی ڕەوتی دیموکراتی لە کوردستان.

٥ـ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی و پارتە سیاسییەکان و دەزگەکانی ڕاگەیاندن تا ڕادەیەکی زۆر توانیوییانە ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردی دا بڵاو بکەنەوە.

## (١ ـ ٣) ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیاریی:

بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی لەم لێکۆڵینەوەیەدا میکانزمێکی زانستی باوەڕپێکراو بەکارهێنراوە کە ئەویش بریتییە لە فۆڕمی ڕاپرسی کە ئەم میکانزمەش زۆر یارمەتیدەرن بۆ کۆکردنەوەی ئەو زانارییانەی کە پێویست بووە لەم لێکۆڵینەوەیەدا، بۆ ئامادەکردنی ئەم فۆڕمانەش ڕەچاوی مەرجی زانستی پێویست کراوە، وە فۆڕمەکە پرسیاری تایبەتی و گشتیی لە خۆدەگرێت سەبارەت بە بواری لێکۆڵینەوەکە لەسەر بابەتی ڕۆشنبیریی سیاسی، ژمارەی پرسیارەکانی نێو فۆڕمەکەش بریێتی بوو لە (١٢) پرسیار بە گشتیی و تایبەتییەوە.

## (١ ـ ٤) سنووری لێکۆڵینەوەکە:

سنووری ئەم لێکۆڵینەوەیەی کە ئێمە ئەنجامانداوە لە ڕووی ماوەی کاتەوە لە ماوەیەکی کەمدا توانیومانە لێکۆڵینەوەکە ئەنجام بدەین لە بەرواری ٢ / ٢ / ٢٠١٠ تاکو ١٠ / ٢ /٢٠١٠، لە ڕووی سنووری جوگرافیشەوە سەنتەری پارێزگەی هەولێر بە نموونە وەرگیراوە.

### (١ ـ ٥) ئامرازەكانی ئاماری:

لــەم لێكۆڵینەوەیــە دا بــە مەبەســتی پیشــاندان و ڕێكخســتن و شــیكردنەوەی زانیارییەكانی نێو نموونــەی لێكۆڵینەوەكــەمان، ســوودمان لــە ئــامرازێكی ئامــاری وەرگرتووە ، كە ئەمەش برێتییە لە ڕێژەی سەدی بەم ڕێسایەی لای خوارەوە

ڕێژەی سەدی = بەش ÷ گشت x ١٠٠

## (٢) خستنەڕووی زانیارییەکان و شیکردنەوەی ئەنجامی فۆڕمەکانی لێکۆڵینەوەکە.

خشتەی ژمارە (١) پێکهاتەی ڕەگەزەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکە ڕوون دەکاتەوە

| ڕەگەز | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| نێر | ١٥١ | ٠٧،٥٨ |
| مێ | ١٠٩ | ٩٣،٤١ |
| کۆی گشتیی | ٢٦٠ | ١٠٠ |

ئەم خشتەیە ڕێژەی پێکهاتەی هەردوو ڕەگەزی تاکەکانی تۆژینەوەکانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە بە جۆرێك کە لە کۆی (٢٦٠) بە شداربوو (١٥١) کە سیان لە ڕەگەزی نێربوون و لە بەرامبەردا (١٠٩) کەسیان لە ڕەگەزی مێن.
واتە لە (٥٨،٠٧٪) بەشداربووانی لێکۆڵینەوەکە ڕەگەزی نێرن لە هەمانکاتدا لە (٤١،٩٣٪) بەشداربووانی لێکۆڵینەوەکە ڕەگەزی مێ بوون. ئەم ئەنجامەش بۆ کۆمەڵگەیەك لە نموونەی کۆمەڵگەی کوردی ڕەنگە سرووشتی بێتە بەرچاو لەگەڵ ئەوەشدا کە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان هەردوو ڕێژەکەدا نییە، بەو پێیەی ڕێژەی نێر لە هەموو بوارەکانی ناو ژیان دا ئامادەییان زیاتر هەیە وەك لە ڕەگەزی مێ بەتایبەت لە پرسە سیاسییەکاندا و بەتەنگەوەهاتنی ئەم دوو ڕەگەزە بۆ پرسە سیاسییە گشتییەکان.

هێلکاری ژمارە (١) پێکهاتەی ڕەگەزەکانی نمونەی لێکۆڵینەوەکە ڕوون دەکاتەوە




خشتەی ژمارە (٢) تەمەنی تاکەکانی نمونەی لێکۆڵینەوەکەمان ڕوون دەکاتەوە.

| تەمەن | ژمارە | % |
|---|---|---|
| ١٨ – ٢٢ | ١٢٩ | ٦١،٤٩ |
| ٢٣ – ٢٧ | ٨٩ | ٢٣،٣٤ |
| ٢٨ – ٣٢ | ٢٢ | ٤٦،٨ |
| ٣٣ـ سەروتر | ٢٠ | ٧٠،٧ |
| کۆی گشتیی | ٢٦٠ | ١٠٠ |

ئەو زانیارییانەی کە لەم خشتەیەی سەرەوەدا هاتووە سەبارەت بە تەمەنی ئەو کەسانەیە کە بەشداربوونە لە پڕکردنەوەی فۆڕمەکانماندا. کە لە (٤٩،٦١٪)ی نمونەی لێکۆڵینەوەکە تەمەنیان لەنێوان (١٨ــ٢٢) سالیدایەو لە (٣٤،٢٣٪) تەمەنیان لە نێوان (٢٣ـ٢٧) ساڵی دایەو بەڕێژەی (٨،٤٦٪) تەمەنیان لە نێوان

هێڵکاری ژمارە (٢) تەمەنی تاکەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکە ڕووندەکاتەوە




(٢٨ـ٣٢) ساڵی بووە، و لە (٧٠،٧%) تەمەنیان لە (٣٣ـ بۆ بەرەو سەرتر) بووە. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە زیاترین ڕێژەی بەشدار بوو لە ڕووی تەمەنەوە دە کەوێتە نێوان (١٨ـ٢٢) ساڵییەوە ئەمەش لەبەرئەوەی کە ڕێژەیەکی زۆر لەوانەی بەشداری پڕکردنەوەی فۆڕمەکانیان کردووە لەو تەمەنەدابوون و قوتابی زانکۆ و پەیمانگەکان بوون، کە دیارە ئەمەش چینێکی دیار و بەرچاوە لە کۆمەڵگە.

**خشتەی ژمارە (٣) پیشەی تاکەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکە ڕوون دەکاتەوە**

| پیشە | ژمارە | % |
|---|---|---|
| قوتابی | ١٨٣ | ٧٠،٣٨ |
| فەرمانبەر | ٣٥ | ١٣،٤٦ |
| پیشە جۆر بە جۆرەکانی تر | ٤٢ | ١٦،١٥ |
| کۆی گشتیی | ٢٦٠ | ١٠٠ |

هێڵکاری ژمارە (٣) پیشەی تاکەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکەمان ڕوون دەکاتەوە




لەم خشتەیەدا دەریدەخات کە لە (٧٠،٣٨٪)ی ئەو تاکانەی کە فۆڕمەکانیان پڕکردۆتەوە و بەشداربون لە لێکۆڵینەوەکەمان پیشەیان قوتابی بووە. لە بەرامبەردا لە (١٣،٤٦٪)ی تاکەکانی نموونەکە پیشەیان فەرمانبەرە، وە لە هەمانکاتدا لە (١٦،١٥٪)ی تاکەکانی بەشداربوو لەلێکۆڵینەوەکەمان پیشەی جۆر بەجۆری دیکەیان هەبووە وەك (دوکاندار، شۆفێر، ڕۆژنامەنوس،

لێتۆژ، بەرگ دوور ... هتد). ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەوەرگرتنی نموونەی لێکۆڵینەوەکەمان (عینە البحث) بە شێوەیەکی زۆر فرەوان نەبووە کە تێکڕای چین و توێژەکان بگرێتەوە زیاتر لەنێوچینی قوتابیاندا فۆڕمەکان دابەشکراوە.

**خشتەی ژمارە (٤) ئاستی خوێندەواری تاكەكانی نموونەی لێكۆڵینەوەكە ڕوون دەكاتەوە.**

| ئاستی خوێندن | ژمارە | % |
|---|---|---|
| نەخوێندەوار | ١ | ٠،٣٨ |
| سەرەتایی | ١٦ | ٦،١٥ |
| ناوەندی | ١٧ | ٥٣،٦ |
| ئامادەیی | ٢٢ | ٤٦،٨ |
| زانكۆ و پەیمانگە | ١٩٢ | ٨٤،٧٣ |
| زانكۆ بەرەو سەر | ١٢ | ٦١،٤ |
| كۆی گشتیی | ٢٦٠ | ١٠٠ |

هێڵكاری ژمارە (٤) ئاستی خوێندەواری تاكەكانی

نموونەی لێكۆڵینەوەكە ڕوون دەكاتەوە



ئەم خشتەیە سەبارەت بە ئاستی خوێندەواری ئەندامانی نموونەی لێکۆڵینەوەکە زانیاریمان پێ دەخشێت، بە جۆرێك کە ڕێژەی خویندنی سەرەتایی بریتییە لە (١٥،٦٪)، خوێندنی ناوەندی (٥٣،٦٪)، خوێندنی ئامادەیی (٤٦،٨٪) بە ڕێژەی (٨٤،٧٣٪) قوتابی زانکۆ و پەیمانگەنیان تەواویان کردووە، وە هەروەها بە ڕێژەی (٦١،٤٪) ئاستی خوێندیان لە زانکۆ بەرەو سەرترە. واتە (ماجستێر و دکتۆرا) تەنیا بە ڕێژەی (٣٨،٠٪) نەخوێندەوارە.

لێرەدا ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئەوەیە کە بەرزترین ڕێژەی کەسەکانی ناو نموونەی لێکۆڵینەوەکە قوتابی زانکۆ و پەیمانگەیان تەواویان کردووە، بۆیە دەتوانین بڵێین زانکۆ و پەیمانگەکان ئەگەر بێت و خۆیان مەیدانێك نەبن بۆ بزاڤ و کار و چالاکی و جووڵانەوە و هێنانە پێشەوەی ڕووداوەکان ئەوا لەڕیزی پێشەوەی هەستکردندان بە پرسێکی کی وەکو ڕۆشنبیریی سیاسی.

خشتەی ژمارە (٥) باری کۆمەڵایەتیی تاکەکانی نموونەکە ڕوون دەکاتەوە .

| باری کۆمەڵایەتی | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| خێزاندار | ٧٠ | ٩٢،٢٦ |
| سەڵت | ١٩٠ | ٥٧،٧٣ |
| کۆی گشتیی | ٢٦٠ | ١٠٠ |

هێڵکاری ژمارە (٥) باری کۆمەڵایەتیی تاکەکانی نموونەکە ڕوون دەکاتەوە.




ئەم خشتەیە باری کۆمەڵایەتیی بەشداربووانی لێکۆڵینەوەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە لە (٢٦،٩٢٪)ی ئەو کەسانەی کە بەشداریان لە ڕاپرسییەکەماندا کردووە خێزاندارن و چوونەتە نێو پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە، لە بەرامبەردا (٥٧،٧٣٪)ی ڕێژەی بەشداربووان سەڵتن و نەچوونەتەوە نێو پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە.

ئەمەش بەشێکی ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ئەو تەمەنەی کە هەیانە بەشێکی دیکەش ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ باری ئابووری تاکەکان، یان هەر هۆکارێکی تر کە شیاوی ئاماژەکردن بێت.

خشتەی ژمارە (٦) هاوکاری و بەشداری تاکەکانی نێو لێکۆڵینەوەکە لەگەڵ ڕێکخراوەکان ڕوون دەکاتەوە .

| هاوکاری و بەشداری لەگەڵ ڕێکخراوەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٨٠ | ٧٦،٣٠ |
| نەخێر | ١٨٠ | ٢٤،٦٩ |
| کۆی گشتیی | ٢٦٠ | ١٠٠ |

له خشتەی ژمارە (٦) ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە کۆی گشتیی نموونەکە بەهەر دوو ڕەگەزەوە، ڕێژەی (٧٦،٣٠٪) لە هاووڵاتییان بەشداری و هاوکارییان هەیە لەگەڵ ڕیکخراوەکان و وەڵامیان بە بەڵێیە، لە بەرامبەردا بەڕێژەی (٢٤،٦٩٪) هاووڵاتییان وەڵامیان بە نەخێر داوەتەوە و هیچ هاوکاری و بەشدارییەکیان نییە لەگەڵ ڕێکخراوەکان.سەرەنجام لە ڕێگەی ئەم نموونەیەوە کە وەرمان گرتووە بۆمان دەردەکەوێ،کەوا هاووڵاتییان هاوکاری و بەشدارییان لەگەڵ ڕیکخراوەکان لە ئاستێکی نزمدایە و زۆرینەی هاووڵاتییان دوورن لەم ڕێکخراوانە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا درێژەپێدەری ئەو دابڕان و دوورکەوتنەوەیەیە کە لە نێوان هاووڵاتییان و ژیانی سیاسیدا هەیە، بۆیە دەکرێ بڵێین دوورکەوتنەوەی هاووڵاتییان لە دامودەزگەکان و میکانیزمەکانی دەسەڵات بەگشتیی و ڕێکخراوەکان بە تایبەتی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت،کە هۆیەکانی هاندان و ئاراستەکردنی هاووڵاتییان بۆ بەشداریکردن لە ژیانی سیاسیدا لاوازە و هیچ هەنگاوێکی بەرچاو لە لایەن خودی دەسەڵات و ڕێکخراوەکانەوە نەنراوە لەم بارەیەوە، لەلایەکی دیکەیشەوە لاوازی کار و چالاکی ڕێکخراوەکان دیار دەکات لە کوردستان کە نەیان توانیوە بەڕاستی ببن بە سەکۆی گفتوگۆ لە نێوان هاووڵاتیان و دەسەڵاتی سیاسییدا، ئەمەش چەندین هۆکاری هەیە، کە ڕەنگە گرینگترینیان پاشکۆیەتی ئەو ڕێکخراوانە بێت بۆ حزب و دەسەڵات.

هێڵکاری ژمارە (٦) هاوکای و بەشداری تاکەکانی نێو لێکۆڵینەوەکە لەگەڵ ڕێکخراوەکان  ڕوون دەکاتەوە




خشتەی ژمارە (٧) وابەستە بوونی تاکەکانی نمونەی لێکۆڵینەوەکەمان بۆ حزبێك یاخوود لایەنێکی سیاسی ڕوون دەکاتەوە .

| وابەستە بوون بۆ حزبێك یاخوود لایەنێکی سیاسی | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١٣٧ | ٥٢،٦٩ |
| نەخێر | ١٢٣ | ٤٧،٣١ |
| کۆی گشتیی | ٢٦٠ | ١٠٠ |

زانیارییەکانی نێو خشتەی ژمارە (٧) بۆمان ڕوون دەکاتەوە،کە لە کۆی گشتیی تاکەکانی نموونەکە بە هەردوو ڕەگەزەکەوە، ڕێژەی (٦٩،٥٢٪) وەڵامی ئەم پرسیارەیان بە بەڵێ داوەتەوە و وابەستەگیان هەیە بۆحزبێك یاخوود لایەنێکی سیاسی، لە بەرامبەردا ڕێژەی (٣١،٤٧٪)ی ئەوە کەسانەی کە بەشداربوون لە ڕاپرسییەکەدا وەڵامی ئەم پرسیارەیان بە نەخێر داوەتەوە و وابەستەگیان نییە بۆ هیچ حزبێك یاخوود لایەنێکی سیاسی.

هێڵکاری ژمارە (٧) وابەستە بوونی تاکەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکەمان بۆ حزبێك یاخۆ لایەنێکی سیاسی ڕوون دەکاتەوە.




لە زانیاریی ناو خشتەکەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بەڕێژەیەکی مامناوەندی هاوولاتییان وابەستەگیان بۆ حزبێك یاخوود لایەنێکی سیاسی هەیە،ئەمەش لە لایەکەوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هاوولاتییان هۆشیاری و ڕۆشنبیرییەکی سیاسی ئەوتۆیان هەیە بەرامبەر حزب و لایەنێکی سیاسی، لە لایەکی دیکەیشەوە بوونی حزبی جۆراوجۆر لە کۆمەڵگەی ئێمەدا وای کردووە کە هەر یەکەیان بە ئاراستە و فۆڕمێکی جیاواز کاریگەری خۆیان هەبێت لەسەر هاوولاتییان و مۆرکی حزبایەتی زۆرینەی لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگە بگرێتەوە.

پاشان بەڕێژەی (٣١،٤٧٪)ی تاکەکانی بەشداربوی نێو ڕاپرسیەکەمان وابەستەبونیان بۆ هیچ حزب و لایەنێکی سیاسی نییە و نەبوون یان لاوازی وابەستەگی حزبی لای تاکی کوردی پێوەندیدارە بە کۆمەڵە هۆکارێك،کە هەندێکیان پێوەستە بەتاکەکان خۆیانەوە کە نایانەوێت کار لەگەڵ حزبەکاندا بکەن و متمانەیان پێ نییە، هەندێکی دیکەشیان پێوەستن بە کێماسیی حزبە کوردییەکان و داخراوییان بەڕووی هاوولاتییان.

خشتەی ژمارە (٨) ڕاو بۆچوونی تاکەکانی نێو لێکۆڵینەوەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی ڕەوشی دیموکراتی لە هەرێمی کوردستان .

| ڕەوشی دیموکراتی هەرێمی کوردستان | ژمارە | % |
|---|---|---|
| ڕەوشێکی سەرکەوتووە | ٩٨ | ٦٩،٣٧ |
| ڕەشێکی سەرنەکەوتووە | ١٤٠ | ٨٤،٥٣ |
| ڕەشێکی مامناوەندە | ١٨ | ٩٢،٦ |
| بێ وەڵام | ٤ | ٥٣،١ |
| کۆی گشتیی | ٢٦٠ | ١٠٠ |

لە زانیارییەکانی نێو ئەم خشتەیەدا ئەوەمان بۆ دەخاتە ڕوو کە بەرێژەی (٦٩،٣٧٪)ی بەشداربووانی نێو ڕاپرسییەکەمان ڕەوشی دیموکراتی لە کوردستان بە ڕەوشێکی سەرکەوتوو لە قەڵەم دەدەن، ئەم هەڵسەنگاندنەشیان بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە لەوانە:

١ـ هەنگاوی گەورە نراوە بۆ پراکتیزەکردنی دیموکراتی لە کوردستان، کە خۆی لە دروستبوونی ڕێکخراوە شارستانی و پیشەیەکان و سەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆن و ڕاگەیاندنی ئازاد و ئازادی ڕادەربڕیندا دەبینێتەوە.

٢ـ بەشداربووان پێیان وایە کەوا پێوەرەکانی دیموکراتی لە هەرێمی کوردستان بونی هەیە، بەو پێیەی هەرێمی کوردستان جیاواز لە دەڤەرەکانیانی دیکەی عێراق و هەنگاوی باش و بەرچاوی بریوە لە ڕووی سەقامگیری سیاسی، خۆشگوزەرانی و...هتد.

٣ـ بوونی فرە حزبی لە کوردستان بە هزر و ئایدیای جیاوازەوە، کە ئەمەش خۆی بۆ خۆی سیمای دیموکراتی قووڵتر دەکاتەوە.

* ئەنجامدانی هەڵبژاردن وگەڕانەوە بۆ ڕای میللەت لە پێکهێنانی دامەزراوەکانی فەرمانڕەوای وەك پەرلەمان تاکو بڵندگۆی ڕاستەقینەی نوێنەرانی میللەت و هاووڵاتیان بێ .

* لە کوردستاندا لەماوەی دوای ڕاپەڕین تاکو ئێستە بە تایبەت تر ئەم چەند ساڵەی دوای توانراوە پێکەوە ژیانێکی ئاشتیانە و شارستانیانە لە نێوان سەرجەم نەتەوە و پێکهاتە جیاوازەکان بە جیاوازی ئاینی و مەزهەبی و وابەستەبونی سیاسی و کۆمەڵایەتی و زمان و کلتورییەوە دابین بکرێت .

لە بەرامبەر ئەم بۆچوونەی سەرەوەشدا بەرێژەی (٨٤،٥٣٪)ی بەشداربووانی لێکۆڵینەوەکەمان پێیان وایە ڕەوشی دیموکراتی لە هەرێمی کوردستان ڕەوشێکی ناسەرکەوتووە لەبەر چەند هۆکارێك لەوانە:

بەشداربووان پێیان وایە دەسەڵات لەژێر ئایدیای حزبدایە و قۆرخی دامودەزگە و فەرمانگە حکومییەکانیان کردووە، هەندێکی دیکەیان پێیان وایە کەوا زۆرینەی بنەما و پرەنسیپەکانی دیموکراتی لە کوردستان تەنیا لە چوارچێوەی دروشمدایە و بەکردەنی پێڕەو ناکرێت. وەك بوونی چەمکی سەروەری یاسا، کێبەرکێی دیموکراتی بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، جیاکردنەوەی دەستی حزب لە حکوومەت، دانانی کەسی شیاو و لێهاتوو بۆ شوێن و کاری شیاو و...هتد.

ـ بەشێوەیەکی پێویست و تەواو ڕێگە نەدراوە،کە خەڵکی داواکاری و داکۆکی لە مافەکانی خۆیان بکەن و پراوە ئازادانەی مافە شارستانی و سیاسییەکانی خۆیان بکەن، کە ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، پەراوێزخستنی توێژێکی هەرە گرینگی کۆمەڵگە لە پرسە جۆربەجۆرەکان کە ئەویش توێژی گەنجانە.

ـ نەبوونی پێوەرە دیموکراتییەکان کە خۆی لە هەڵبژاردنێکی ئازاد و شەفاف بۆ دەستاو دەستکردنی ئاشتییانەی دەسەڵات و دوورخستنەوەی دەستی حزب لە

حکوومەت و ئازادییەکی تەواو و ئۆپۆزسیۆنێکی کارا و جیاوازی نەکردن لە نێوان تاکەکان بە هۆی ڕاوبۆچونی جیاواز و وابە دا دەبینێتەوە وابەستەبوونیان

ـ فەراهەم نەکردنی پێداویستیە جۆر بە جۆرەکان بۆ هەموو تاکەکان بەبێ جیاوازی بەشێوەیەکی تەواو لە هەموو ڕوویەکەوە هەبوونی گەندەڵی و تاکڕەوی و نادادپەروەری و زاڵبونی بەرژەوەندی حزبی بەسەر بەرژەوەندییە گشتییەکان.

لە هەمانکاتدا بەرێژەی (٩٢،٦٪)ی بەشداربووان وای دەبینن کە ڕەوشی دیموکراتی لە کوردستان ڕەوشێکی مامناوەندە، بەو پێیەی کەوا هەنگاوی باش نراوە لەم ڕووەوە، هەرچەندە دەبێ کاری زیاتر بکرێت بۆ سەرکەوتنی پرۆسەی دیموکراتی لە هەرێمی کوردستان لە لایەن هەموو چین و توێژەکانەوە، لەبەرئەوەی تا ئێستەش کولتووری کۆمەڵگە و ئەقڵێەتی حزبەکان کۆسپن لەبەردەم بەرەو پێشچوونی ڕەوشی دیموکراتی لە هەرێمی کوردستان دا.

بە ڕێژەی (٥٣،١٪) تاکەکانی لێکۆڵینەوەکەمان وەڵامی ئەم پرسیارەیان نەداوەتەوە.

| |
|---|
| هێڵکاری ژمارە (٨) ڕاو و بۆچوونی تاکەکانی نێو نموونەی لێکۆڵینەوەکەمان ڕوون دەکاتەوە سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی ڕەوشی هەرێمی کوردستا |



خشتەی ژمارە (٩) ڕۆڵی ڕۆشنبیران لە گەشەدان بە ڕەوتی دیموکراتی لە کوردستان ڕوون دەکاتەوە .

| ڕۆڵی ڕۆشنبیران لە گەشەدان بە ڕەوتی دیموکراتی لە کوردستان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆر | ٢٥ | ٦١،٩ |
| تارادەیەك | ١٧٦ | ٦٩،٦٧ |
| نییە | ٢٨ | ٧٦،١٠ |
| نازانم | ٣١ | ١١،٩٢ |
| کۆی گشتیی | ٢٦٠ | ١٠٠ |

لە خشتەی ژمارە (٩) دا لە کۆی گشتیی ئەو تاکانەی کە بەشداربوون لە لێکۆڵینەوەکەمان ڕێژەی (٦١،٩٪) پێیان وایە کەوا ڕۆشنبیران ڕۆڵێکی زۆریان هەبووە لە گەشەدان بە ڕەوتی دیموکراتی لە کوردستان، وە ڕێژەی (٦٧،٦٩٪) دەڵێن تارادەیەك ڕۆشنبیران ڕۆڵیان گێڕاوە لەم ڕووەوە،هەروەها ڕێژەی (٧٦،١٠٪)ی بەشداربووان پێیان وایە کەوا ڕۆشنبیران ڕۆڵیان نییە لە گەشەدان بە ڕەوتی دیموکراتی لە کوردستان،لە بەرامبەردا ڕێژەی (١١،٩٢٪) وەڵامی ئەم پرسیارەیان بەنازانم داوەتەوە. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ڕۆشنبیران بە ڕێژەیەکی زۆر تارادەیەك ڕۆڵیان هەبووە لە گەشەدان بەڕەوتی دیموکراتی لە کوردستان، دەستەبژێرێکی ڕۆشنبیران لە هەر کۆمەڵگەیەکدا بە دەستەبژێری زۆر هۆشمەند و زیندوو دادەنرێت و دەتوانن جێ دەستیان دیار بێت لەزۆر ڕووەوە بەو پێیەی کە دەتوانن لە ڕێگەی هزر و نووسینەکانیان کاریگەری دابنێن لەسەر تاکەکان.

هێڵکاری ژمارە (٩) ڕۆڵی ڕۆشنبیران لە گەشەدان بەرەوتی دیموکراتی لە کوردستان ڕوون دەکاتەوە .



خشتەی ژمارە (١٠) ڕۆڵی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی و پارتە سیاسییەکان و دەزگەکانی ڕاگەیاندن ڕوون دەکاتەوە لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردیدا .

| ڕۆڵی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی و پارتە سیاسییەکان و دەزگەکانی ڕاگەیاندن | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| تارادەیەکی زۆر | ٣٠ | ٥٣،١١ |
| تارادەیەکی مامناوەند | ١٣٤ | ٥١،٥٣ |
| تارادەیەکی کەم | ٩٦ | ٣٦،٩٢ |
| کۆی گشتیی | ٢٦٠ | ١٠٠ |

هێڵکاری ژمارە (١٠) ڕۆڵی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی و پارتە سیاسییەکان و دەزگەکانی ڕاگەیاندن لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردیدا ڕوون دەکاتەوە .



لـە خشـتـەی ژمـارە (١٠)دا لـە کـۆی گشـتـیی ئـەو تاکانـەی کـە بەشـداریان لـە لێکۆڵینەوەکـەدا کـردووە، ڕێـژەی (١١،٥٣٪) پێیـان وایـە کـەوا تاڕادەیـەکی زۆر ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی و پارتە سیاسییەکان و دەزگـەکانی ڕاگەیانـدن ڕۆڵیان هەبووە لە بڵاو کردنەوەی ڕۆشنبیریی سیاسـی لـە کۆمەڵگـەی کوردیـدا، لـە هەمانکاتدا بە ڕێژەی (٥١،٥٣٪)ی تاکەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکە لەو بڕوایـەدان کـە ڕێکخراوەکـانی کۆمەڵگـەی شارسـتانی و پارتـە سیاسـییەکان و دەزگـەکانی ڕاگەیاندن تا ڕادەیەکی مامناوەند ئەم ڕۆڵەیان گێڕاوە و کاریان کـردووە لەسـەر بـە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردیدا، لە بەرامبەریشدا بە ڕێژەی (٩٢،٣٦٪)ی بەشداربووان وایدەبینن کەوا ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگـەی شارسـتانی و پارتە سیاسییەکان و دەزگەکانی ڕاگەیاندن تاڕادەیەکی کـەم توانیویانـە ڕۆشـنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردیدا بڵاو بکەنەوە.

لێرەدا ئەوەی جێگەی ئاماژە پێکردنە ئەوەیە کەوا بە ڕێژەی (٥١،٥٣٪)ی تاکەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکە ڕۆڵی هەر یەکە لە ڕێکخراوەکـانی کۆمەڵگـەی شارسـتانی و پارتە سیاسییەکان و دەزگەکانی ڕاگەیاندن لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی سیاسـی لـە کۆمەڵگەی کوردیدا بە ڕادەیەکی مامناوەندی لە قەڵەم دەدەن .

خشتەی ژمارە (١١) توانای ئەو کەناڵانە ڕوون دەکاتەوە، کـە زیـاتر توانیویانـە ڕۆشنبیریی سیاسی لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا لای تاکی کورد بەرزبکەنەوە .

| کەناڵەکان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| پارتە سیاسییەکان | ٥٢ | ٢٠ |
| ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی | ٤٦ | ١٧،٦٩ |

| | | |
|---|---|---|
| دەزگەکانی راگەیاندن | ١٥٠ | ٥٧،٦٩ |
| بێ وەڵام | ١٢ | ٤،٦١ |
| کۆی گشتیی | ٢٦٠ | ٪١٠٠ |

هێڵکاری ژمارە (١١) توانای ئەو کەناڵانە ڕوون دەکاتەوە کە زیاتر توانیویانە ڕۆشنبیریی سیاسی لە ناو کۆمەڵگەی کوردیدا لای تاکەکان بەرزبکەنەوە .



لە زانیارییەکانی نێو ئەم خشتەیەدا ئەوەمان بۆ دەخاتە ڕوو کە بە ڕێژەی (٢٠٪)ی بەشداربوانی نێو ڕاپرسیەکەمان لەو بڕوایەدان کە پارتە سیاسییەکان یەکێکن لەو کەناڵانەی کە زیاتر توانیویەتی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردیدا لای تاکەکان بەرزبکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە ڕێژەی (١٧،٦٩٪)ی تاکەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکە پێیان وایە کە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی لەو کەناڵانەیە کە توانیویەتی ئەم ڕۆڵە بگێڕێت، لە بەرامبەریشدا بە ڕێژەی (٥٧،٦٩٪)ی بەشداربوان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن،کەوا دەزگەکانی ڕاگەیاندن یەکێك بوە لەو کەناڵانەی کە زیاتر توانیویەتی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردیدا لای تاکەکان بەرزبکاتەوە، هەروەها بە ڕێژەی (٤،٦١٪)ی بەشداربووان وەڵامی ئەم پرسیارەیان نەداوەتەوە،لە زانیاریی ناو خشتەکەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ڕێژەیەکی زۆری هاووڵاتییان لەو بڕوایەدان کە دەزگەکانی ڕاگەیاندن زیاتر لە پارتە سیاسییەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی دەتوانێ ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردیدا لای تاکەکان بەرزبکاتەوە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە میدیا وەك تەکنۆلۆژیایەکی سەردەم بە شێوەیەکی بەرچاو بڵاوبۆتەوە و سنوورەکانی بەزاندووە و لە ڕێگەی بەرنامە جۆربەجۆرەکانییەوە زۆرترین کاریگەری دادەنێت لەسەر تاکەکان، لەم ڕووانگەشەوە دەزگەکانی ڕاگەیاندن لە ڕێگەی بەرنامەی سیاسی و تایبەت بە ڕۆشنبیریی سیاسی و هۆشیارکردنەوەی تاکەکان توانیویەتی ئاستی ڕۆشنبیریی سیاسی لای تاکی کورد بەرزبکاتەوە.

ϖ به ڕای تۆ، چی بکرێت باشه بۆ ئەوەی ڕۆشنبیریی سیاسی لای تاکی کورد له ئاستێکی بەرزدا بێت؟.

له میانەی پرسیاری نێو فۆڕمی ڕاپرسییەکەمان، ئەم پرسیارە کراوەیەمان خستۆته ڕوو بۆ ئەوەی تاکەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکه ڕای خۆیان دەربڕن سەبارەت بەم پرسە. تێکڕای وەڵامی بەشداربووانی لێکۆڵینەوەکه لەم چەند خاڵەدا دەخەینه ڕوو:

- له بنەڕەتدا پرۆسەی ڕۆشنبیریی سیاسی پرۆسەیەکی گشتیی و بەردەوامە، بۆیه پێویسته که هەموو دامودەزگەکانی سیستەمی سیاسی کار بۆ پەرەپێدانی بکەن.
- کارکردن بۆ هێنانەدی سەروەری یاسا و بەرجەستەکردنی ناوەڕۆکی دیموکراتی و پاراستنی مافی مرۆڤ و ئازادییەکانی تاك و دادپەروەری کۆمەڵایەتی و هاندانی گەنجان بۆ ناو دەسەڵات و کەمکردنەوەی جیاوازی و بڵاوکردنەوەی یەکسانی و بەدەمەوە هاتنی داواکاری خەڵکی و فریو نەدانیان به بەڵێنی بێ بنەما و پێدانی زیاتری ڕۆڵی تاك له پرۆسەی بڕیاردان دا.
- بایەخی پتر به بواری ڕاگەیاندن بدرێت و سەربەخۆیی و ئازادییەکی زیاتری پێ ببەخشرێت و له پاشکۆیەتی حزب دووربخرێتەوە، لە بەرامبەریشدا دەبێت ڕۆڵی دەزگەکانی ڕاگەیاندن به ئاراستەی کاری گشتیی و ناساندنی سیاسەت بەواتای ڕاستەقینەی خۆی بێت، نەك بەرتەسك کردنەوەی بۆ لایەنێکی سیاسی دیاری کراو.
- هەوڵبدرێت گوتاری ناسیۆنالیستی نەبێتە گوتارێکی سەرکەر لە بەرامبەر ڕۆشنبیرکردن و پتەوکردنی هۆشیاریی سیاسی لای تاکەکان، چونکه دواجار هەر ئەو ڕۆشنبیریه سیاسییەیه که ئاستی بەشداری سیاسی تاکەکان بەرزدەکاتەوە و لە بەرامبەریشدا تاکەکان له لاموبالاتی سیاسی دوردەخاتەوە.
- پێویسته هەموو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی بەشداری کارایان هەبێت لە میانەی کاری خۆیان بۆ ئەوەی خەڵکی ئاشنا بکەن به پرسە جۆر بەجۆرەکان، لە نێویشیاندا پرسی ڕۆشنبیریی سیاسی، بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت گرینگی زیاتر بە

ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی بدرێت و لەژێر چەپۆکی حزب بهێنرێتە دەرەوە و کاربکرێت بۆ سەربەخۆییان.

ـ ڕاگەیاندنەکان دەبێت ڕۆڵی خۆی بگێڕێت لە ڕۆشنیرکردنی خۆیان بگرن لە ڕێگەی دانانی بەرنامەی تایبەتمەند لەم بوارەدا، ئەمەش لە ڕێگەی پێداچوونەوە بە بەرنامە و پرۆگرامەکانی دەزگەکانی ڕاگەیاندن.

ـ پارتە سیاسییەکان بەو پێیەی کە زۆرترین ئەندامیان لە خۆگرتووە بە بەراورد بەدامەزراوەکانی دیکە، بۆیە دەبێت لە هەمبەر پرسێکی وەکو ڕۆشنبیریی سیاسیدا زۆرترین وزە و توانای خۆیان لە پێناو ڕۆشنبیرکردنی تاکەکان خەرج بکەن لە ڕێگەی بونی پلانێکی تۆکمە لەسەرجەم ڕێکخستنەکانیان بۆ ئەم کارە.

ـ گرینگی دان بە ناوەند و دەزگە زانستییەکانی وەکو کۆلێژەکان و دەزگەکانی تۆژینەوەی زانستی، هەوڵ بدرێت ڕیفۆرمێکی گشتیی لە پرۆگرامی خوێندنی زانکۆکاندا بکرێت بەجۆرێك کە بتوانرێت لە ڕێگەیەوە ئاستی زانستی قوتابیان و خوێندکارانی پێ بەرزبکرێتەوە لە بوارە جۆربەجۆرەکان.

ـ فرەوانترکردنی پانتایی دیموکراتی و ئازادی ڕادەربڕین و هاندانی زیاتری هاوولاتیان بۆ بەشداری لە پرۆسە سیاسییەکان و کردنەوەی سەنتەرەکانی ڕۆشنبیریی بۆ گەشەپێدانی چینەکانی کۆمەڵگە.

ـ بایەخدان بە کۆڕ و سیمینار و ۆرك شۆپ لەلایەن کەسانی شارەزا و ڕۆشنبیرانی سەربەخۆ، کە دەیانەوێت کەتوار وەك خۆی وێنا بکەن، لەگەڵ کردنەوەی خولی جۆراوجۆر بۆ ئاشناکردنی تاك بە چەمکی ڕۆشنبیریی سیاسی.

## (٣) بەرئەنجامی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکە و ڕاسپاردە و پێشنیازەکان:

### (٣ ـ ١) بەرئەنجامی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکە.

بە شێوەیەکی گشتیی دەتوانین گرینگترین ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکە لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە :

ـ لە نموونەی لێکۆڵینەوەکەدا بۆمان دەرکەوتووە، کە ڕێژەی (٣٠،٧٦٪)ی تاکەکانی نموونەکە بەشداری و هاوکاریان هەیە لەگەڵ ڕێکخراوەکان، لە بەرامبەردا لەسەرجەمی نموونەکە دا بە ڕێژەی (٦٩،٢٤٪)ی تاکەکان هیچ جۆرە بەشداری و هاوکارییەکیان نییە لەگەڵ ڕێکخراوەکان، ئەمەش لە ڕاستی دا درێژەپێدەری ئەو دابڕان و دوورکەوتنەوەیە یە کەلە نێوان هاوولاتییان و ژیانی سیاسییدا هەیە، لە هەمانکاتدا ئەم بەرئەنجامە ڕاستی و دروستی گریمانەی یەکەمی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکە دەسەلمێنێت.

ـ زۆرینەی بەشداربووانی لێکۆڵینەوەکەمان بە ڕێژەی (٦٢،٥٢٪)ی وابەستبونیان بۆ حزبێك یاخوود لایەنێکی سیاسی هەیە، ئەم ئەنجامەش ڕاستی و دروستی گریمانەی دووەم دەسەلمێنێنت لە لێکۆڵینەوە مەیدانییەکە. بەوپێیەی کە حزب لە کۆمەڵگەی کوردیدا لە زۆرینەی بوارەکانی ژیانی تاکەکاندا بوونی هەیە و کاریگەری خۆی بە جێ دەهێڵێ لەسەریان.

ـ لە نموونەکەدا دەردەکەوێت کە بە ڕێژەی (٨٤،٥٣٪)ی بەشداربوانی نێو ڕاپرسیەکەمان ڕەوشی دیموکراتی لە کوردستاندا بە ڕەوشێکی ناسەرکەوتوو لە قەڵەم دەدەن، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك کە لە شرۆڤەکردنی پرسیاری سێ یەمی

ڕاپرسیەکەماندا ئاماژەمان پێداوە، ئەم ئەنجامەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کەوا گریمانەی سێ یەم لە لێکۆڵینەوە مەیدانییەکەدا نە هاتۆتەدی و ڕاست دەرنەچووە.

-لەسەرجەمی نموونەی لێکۆڵینەوەکەمان دا بە ڕێژەی (٦٩،٦٧٪)ی تاکەکانی بەشدار لە لێکۆڵینەوەکەمان، تاڕادەیەك ئاماژە بە ڕۆڵی ڕۆشنبیران دەکەن لە گەشەدان بە ڕەوتی دیموکراتی لە کوردستان ئەمەش لە لایەکەوە تا ئەندازەیەك پشتگیری لەو گریمانەیەمان دەکات کە پێمان وابوو ڕۆشنبیران ڕۆڵێکی بەرچاو و کاریگەر دەگێڕن.

-لە لێکۆڵینەوەکەماندا بە ڕێژەی (٥٣،٥١٪) ڕۆڵی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی و پارتە سیاسییەکان و دەزگەکانی ڕاگەیاندن لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردی دا، بە ڕۆڵێکی تاڕادەیەك مامناوەند لە قەڵەم دەدەن بە حوکمی ئەو دەورو کارو چالاکیانەی کە دەیگێڕن لە کۆمەڵگە. ئەمەش بەشێوەیەکی تەواو پشتگیری لە گریمانەی پێنجەمی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکەمان ناکات و پشتڕاستی ناکاتەوە.

## (٣ – ٢) پێشنیاز و ڕاسپاردەکان.

لە بەر ڕۆشنایی ئەنجامــەکانی لێکۆڵینــەوە مەیدانییــە کــە دەتــوانین ئــەم چــەند پێشنیاز و ڕاسپاردەیە بخەینە ڕوو:

- هەوڵ بــدرێت لەلایــەن دەســەڵاتەوە بــۆ کەمکردنــەوەی هــەژموون و کاریگــەری و حزبــەکان لەســەر کۆمەڵــە و ڕێکخراوەکــانی کۆمەڵگــەی شارســتانی و دەزگــەکانی ڕاگەیاندن، وە چالاککردنی ڕۆڵی ئەم ڕێکخرا و دەزگەیانە لەنێو کۆمەڵگەدا.
- بایەخ و گرینگی پێدانی زیــاتری چــینی ڕۆشــنبیران بــە تایبــەتی تــر ڕۆشــنبیرانی سەربەخۆ، لە ڕێگەی پێدانی دەرفەتی زیاتر بۆیان لە کردنەوەی کــۆڕ و ۆرك شــۆپ و خولی و جۆراوجۆر، بۆ ڕوونکردنەوەی چەمك و پرسە جیاوازەکان بۆ هاووڵاتییــان لــە پێناو بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی لایان، بە هەموو چین و توێژەکانەوە.
- ڕێکخراوەکان بە هەموو چەشنەکانییەوە لە خودی خۆیان دا پێداچوونەوەیەکی جدی لە کار و چالاکی و پێڕەو و پرۆگرامەکانیان بکەن، هەوڵ بدەن کاری زیاتر و چالاکی بەسوودتر و دانانی پرۆگرامی زانستی و ئەکادیمی تاکو بتوانن بە ئاراستەی برەودان بە بەرزکردنەوەی ئاستی تاکەکان کاربکەن.
- پێویستە لە زانکۆکانی هەرێمی کوردستان، هــەروەها لەلایــەن لێتــوێژ و پســپۆڕان زیاتر هەوڵی بدرێت بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینــەوەی زانســتی تایبــەت بــە ڕۆشــنبیریی سیاســی و هۆشــیاری سیاســی، بــۆ ئــەوەی ئاســتەنگەکان دەستنیشــان بکرێــت و چارەسەریەکانیش بخرێتە ڕوو، تــاوەکو لــەم ڕێگەیــەوە بتوانرێــت ئاســتی هۆشــیاری تاکەکان لەبارەی پرسێکی لەم جۆرە بەرزبکرێتەوە.
- حکوومــەت و لایەنــە پێوەندیــدارەکان پێویســتە زیــاتر هــەولی زیــاتر بــدەن بــۆ باشــترکردنی گــوزەرانی هاووڵاتیــان و هەولــدان بــۆ کرانــەوەی زیــاتری کەناڵــەکانی بەشداریکردن بە ڕووی هەموو توێژەکانی کۆمەڵدا بەتایبەتی توێژی گــەنجان و لاوان، چونکە چینی گەنجان لە هەموو کۆمەڵگەیەك دا داینەمۆی هەڵسوڕاندنی کۆمەڵگەن، بەو ئایدیا و ئامانجانەی کە لە ناخیان دایە.

## بەرئەنجام

بەشێوەیەکی گشتیی بەرئەنجامەکانی تۆژینەوەکە بەهەر دوو لایەنی تیۆری و مەیدانییەوە لەم چەند خاڵەدا دەخەینەڕوو:
ڕۆشنبیریی سیاسی بریتییە لە کۆی ئەو بیرو بۆچو،ن و زانیاری و تێڕوانین و ئاراستە و بەها باوەڕپێکراوانەی کە بەشێوەیەکی ڕێکخراو واتایەك بە پرۆسەی سیاسی دەبەخشێت، سەبارەت بە کاروباری سیاسی و حوکمڕانی، دەوڵەت و دەسەڵات، وابەستەگی و ڕەوایەتی و بەشداریکردن، کە پێوەندیان بە سیاسەتەوە هەیە لە هەموو کۆمەڵگەکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا سرووشتی پێوەندی نێوان هاووڵاتی و حکوومەت ڕوون دەکاتەوە، بەجۆرێك کە هەموو نەتەوەیەك خاوەنی ڕۆشنبیریی خۆیەتی کە بەشێکە لە سەرخانی ڕابردووی و دەوڵەمەندیشی دەکات بە ڕۆشنبیریی سەردەمەکەی، ڕۆشنبیریی سیاسی پێوەندییەکی پتەوی بە هەڵسوکەوت و ژیانی تاکەکانەوە هەیە، لەهەمانکاتدا کاریگەری خۆی بەجێ دەهێڵێ لەسەر سیستەمی فەرمانڕەوایی و ڕەوتی بەدیموکراتیکردنی کۆمەڵگە.
ڕۆشنبیری سیاسی پێویستیی بە سەقامگیری سیاسی هەیە، چونکە هاوڕێکی لە نێوان جۆری ڕۆشنبیریی سیاسی و جۆری بونیادە□سیاسییەکە ئارامی و سەقامگیری سیستەمی سیاسی بەرقەرار دەکات. وەئەگەر ئەم دوو توخمە (ڕۆشنبیریی سیاسی لە لایەك و سیستەمی سیاسی لە لایەکی دیکەوە) لەناو هەر کۆمەڵگەیەکدا کۆك نەبوون ئەوا کەلێنێ لە نێوان بونیادی سیستەمی سیاسی و ڕۆشنبیریی سیاسی دروست دەبێت و هەڕەشە لەسەر کاری ئەو سیستەمە دروست دەکات. بۆیە جێگیربوونی سیاسی پشت بە ڕۆشنبیریی سیاسی دەبەستێت، تەبایی وکۆکبونی

ڕۆشـــنبیریی سیاســی دەســتەبژێر (حاکمــەکان) و ڕۆشـــنبیریی سیاســی هــاووڵاتی یارمەتیــدەرن بــۆ جێگیربــوونی سیاســیك بەپێچەوانەشــەوە پارچــە پارچــە بــوونی ڕۆشنبیریی و جیاوازی نێوان ڕۆشنبیریی جەماوەر و ڕۆشنبیریی دەستەبژێر سەرچاوەی هەڕەشەکردنە بۆ جێگیربوونی سیستەمی سیاسی بۆیــە دەبیــنین پێوەندییــەکی پتــەو هەیە لە نێوان ڕۆشنبیریی سیاسی و شێوازی سیستەمی سیاسی و بەشێوەیەکی تونـد پێکەوە گرێدراون.

لە بەدیهێنانی دیموکراتیدا گرینگی ڕۆشنبیری سیاسی و ئەو ناوەندانە دەردەکـەوێت، کە کار لەسەر بلاوکردنەوەی هۆشیاری و ڕۆشنبیریی سیاسی دەکەن. کە تاچ ڕادەیەك کاریگەرییان هەیە لە فەراهــەمکردنی دیمــوکراتی، چــونکە لــە بنەڕەتــدا دیمــوکراتی برێتییە لەو سیستەمەی دەرفەتی بەشداریکردن لە پرۆسەی سیاســیدا بــۆ تاکەکـەس دەخولقێنێ، بۆیە تەنانەت ئەگەر ڕێساو یاسا دیموکراتییەکانیش لە ولاتێکدا بەرقەرار و لەئارادا بن، بەبێ تاکەکەسی هۆشـیار و ڕۆشـنبیر بــە پرســە جۆربــەجۆرەکان ئــەم پرۆسەیە ناتەواو و پڕ لە کەموکوڕی دەبێت، لەبەرئەوەی دیموکراتی ڕاستەقینە، تەنیا کاتێك دەتوانێت بوونی هەبێت، کە تاکەکان خاوەن ویستی ئازادبوونی هــەبێت و لــە ڕێگەی ئــەو باکگراوەنــدە ڕۆشــنبیرییەی کــە هەیــەتی. ئەمــەیش تــەنیا لەڕێگــەی بلاوبوونەوەی هۆشیاری و ڕۆشنبیریی سیاسی و ئازادکردنی تاکەکەس لە کۆتوبەندی پێوەندییە کۆمەلایەتییە خێلەکییەکانەوە بونیاد دەنرێت. بۆیە لێرەوە دەگەین بەو یە بەرئەنجامەی کە ڕۆشنبیریی سیاسی بە ئاستێکی بەرز لە هەر کۆمەلگەیەکداولــەلای هەر تاکێك، کاریگەری دەبێت لە فەراهەمکردنی بنەماکانی دیموکراتیدا.

بەدیهێنانی ڕۆشنبیریی سیاسی لەناو کۆمەلگەیەکی دیموکراتی و لە ژیانی سیاسییدا، لــە ڕێگــەی چــەندین کــەنالی جۆراوجــۆرەوە فەراهــەم دەبێــت، بــەلام کەنالــەکانی وەکــو (پارتەسیاسییەکان، ڕێکخراوەکانی کۆمەلگەی شارستانی، دەزگەکانی ڕاگەیاندن، خێـزان و قوتابخانە) لەم ڕووەوە ڕۆلی زیاتر دەگێڕن، بەو پێیەی کە ئەم کەنالانە لە کۆمەلگەیەکی دیموکراتی و پێشکەوتوودا دیارترین ئامرازەکانی پەرەپێدانی ڕۆشنبیرین.

ئەو جۆرە ڕوشنبیریە سیاسییەی کە لە کۆمەڵگەی کوردی لە هەرێمی کوردستاندا تێبینی دەکرێت، خۆی لە جۆری ڕۆشنبیریی سیاسی، پاشکۆیەتی دا دەبینێتەوە، لەبەرئەوەی هەرچەندە هاووڵاتیان لەم جۆرە ڕۆشنبیریە سیاسییەدا، هۆشمەند دەبن بە سیستەمی سیاسی و ئەو کارانەی کە دەیکات، بەڵام لە ڕاستیدا تاکەکان هەستێکی لاواز و سادەیان هەیە بۆ کار و چالاکی سیاسی. هەرێمی کوردستانیش وەك بەشێك لە عێراق بەهۆی دەسەڵاتی سەرکوتکەرانەی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکان کەلەم وڵاتەدا دەسەڵاتیان لە دەستبووە، کاریان لەسەر بەرتەسککردنەوەی هەموو جموجوڵ و بەشداری و کاروچالاکی سیاسی هاووڵاتییان کردوە، وایان لێکراوە کە بەهەمان ئەقڵییەتی چینی فەرمانڕەوا بیربکەنەوە، وە لێ نەگەڕاون تاك لە دەرەوەی چوارچێوەی دەسەڵات هیچ جۆرە بەشدارییەکی سیاسیان هەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەم چەند ساڵەی دواییدا لە هەرێمی کوردستاندا تاڕادەیەك زەمینەسازییەك ڕەخساوە بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی کوردی ئەم جۆرە ڕۆشنبیرییە تێپەڕێنێت و بەرەو ڕۆشنبیریی سیاسی بەشداریکردن هەنگاوبنێت.

لە ڕێگەی ئەو نموونەیەوە کە لە لێکۆڵینەوە مەیدانییەکەدا وەرمانگرتووە، بۆمان دەردەکەوێ ،کەوا هاووڵاتیان لە هەرێمی کوردستان هاوکاری و بەشدارییان لەگەڵ ڕێکخراوەکان لە ئاستێکی نزمدایە و زۆرینەی هاووڵاتیان دوورن لەم ڕێکخراوانە، ئەمەش خۆی لە خۆی دا درێژەپێدەری ئەو دابڕان و دوورکەوتنەوەیەیە،کە لە نێوان هاووڵاتییان و ژیانی سیاسییدا هەیە، ئەمەش لەلایەکەوە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئامرازەکانی هاندان و ئاراستەکردنی هاووڵاتییان بۆ بەشداریکردن لە ژیانی سیاسییدا لاوازە و هەنگاوێکی بەرچاو لە لایەن خودی دەسەڵات و ڕێکخراوەکانەوە نەنراوە لەم بارەیەوە، لەلایەکی دیکە هەوە بۆ لاوازی ئەدای کاری ڕێکخراوەکان دەگەڕێتەوە لە کوردستان کە نەیان توانیوە بەڕاستی ببن بە پردی دایەلۆگ و گفتوگۆ لە نێوان هاووڵاتیان و دەسەڵاتی سیاسی و مەڵبەندی ڕێنمونی و هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگە.

بەشێوەیەکی گشتیی ڕۆشنبیریی سیاسی لای تاکی کورد لە ئاستێکی بەرزو پێویستدا نیە وە ئەو هۆشیاری و مەعریفە سیاسییەی کە لای تاکەکاندا تاکەکاندا هەیە بەرهەمی ئەو

ژینگەیەیە کە لەم هەرێمەدا خولْقاوە، کە چەندین هۆکار دەستیان لە دیهێنانی دا هـەبووە لەوانە.

ناکارایی و سستی کاری پارتە سیاسییەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی و دەزگەکانی ڕاگەیاندن لە هەرێمی کوردستاندا، لە پـاڵ ئەوەیشـدا لاوازی دامودزگـە پەروەردەیی و ئەکادیمیەکان لـە ڕووی بەرنامـە و پرۆگرامـی زانسـتییەوە بۆشـاییەکی گەورەی لەئارادایە لە ڕۆڵی ئەم دامو دەزگەیانەشدا لە ئەنجامـدانی پرۆسـەی پێگەیانـدنی سیاسی و پەروەردەکردنی سیاسی و هۆشیارکردنەوەی هاوولاتییان یەکجار لاوازە

کەنارگیری و خۆگرتنی هاوولاتیان لە ژیانی سیاسیشدا گرینگی نەدانی هاوولاتییان بە پرسە سیاسییەکان بەشێوەیەکی گشتیی، لەبەرئەوەی لەلایەکەوە تاکـەکان بـۆ خۆیـان لـە کاری سیاسییدا خۆیان دەپارێزن و گرینگی بەکاری سیاسی نادەن و هیچ مـەیلێکیان نیـە بـۆ پرۆسـە سیاسـییەکان، لەلایـەکی دیکەشـەوە هۆیـەکانی هانـدان و ئاراسـتەکردنی هاوولاتییان بۆ بەشداریکردن لە ژیانی سیاسییدا لاوازە.

## سەرچاوە کوردییەکان:

ــ ئەبوبەکر عەلی، ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی، بەرگی دووەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٨.
ـ ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی، ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی ئیسلامی، چاپی یەکەم، خانەی چاپ و بلاوکردنەوەی چوار چرا، سلێمانی، ٢٠٠٨.
ـ بەهرام محەمەد کاکل، ڕۆشنبیریی... کۆمەڵگەی شارستانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی بینای، سلێمانی، ٢٠٠٦.
ــ جەعفەر عەلی، ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیریی، سلێمانی، ٢٠٠٤.
ـ چنار سەعد عەبدولا، کاریگەری باری سیاسی لەسەر گەشەکردنی هۆشیاری نەتەوەیی کورد دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١، چاپی یەکەم، بەڕێوبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیریی، هەولێر، ٢٠٠٥.
ـ خالید خاڵ، کوردایەتی و ڕۆشنبیریی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٧.
ـ دامەزراوەی میهەن، کۆمەڵگەی شارستانی هێزێکی نوێ، و: کۆسار فەتاحی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیریی، هەولێر، ٢٠٠٦.
ـ ڕابەر تەڵعەت، گەنج و بەشداری سیاسی، چاپی یەکەم، دەزگەی تۆژینەوەی موکریانی، هەولێر ، ٢٠٠٦.
ـ ڕامین جەهانبەگلو، مۆدێرنەکان، و: ئازاد بەرزنجی، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩.
ـ ڕزگار محەمەد قادر، لە پێناو کوردستانێکی نوێ دا، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧.

ـ ڕەفیق سابیر، کەلتوور و ناسیۆنالیزم، چاپی دووەم، دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.

ـ سەعید مەموزینی، سیاسەت گەمەیەکی بەردەوام، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠١٠.

ـ سۆران علیپور، ڕۆشنبیر کێ یە ؟ چارەنوسی چییە ؟، کۆمەڵەوتار، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧.

ـ د.شێرزاد نجار، هزر و سیاسەت، بەرە و ڕۆشنبیرێکی هاو چەرخ، و : محەمەد وەسمان، دەزگەی O.P.L.C بۆ چاپ و بلاوکردنەوە، هەولێر، ٢٠٠٥.

ـ عوسمان عەلی وەیسی، حزب لە کۆمەڵگەی سەردەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٩.

ـ عومەر حەمەدەمین نورەدینی، سیستەمی نوێی جیهانی و دۆزی کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٣.

ـ د.کەریم أبوحلاوە، گیروگازی چەمکی کۆمەڵی شارستانی، و: اسماعیل کوردە ـ ڕەوشت ڕەشید ـ نوری بێخاڵ ، چاپی دووەم، لەبلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، هەولێر، ٢٠٠٤.

ـ د. کەمال مەنوفی، تیۆری سیستەمە سیاسییەکان، و: ئاوات ئەحمد، چاپی یەکەم، چاپخانەی یاد، شوێن نەنوسراوە، ٢٠٠٧.

ـ کۆمەڵێك نووسەر، زانستی سیاسی، و: ئاوات ئەحمد، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٦.

مەریوان وریا قانع، شوناس و ئالۆزی، چاپ نەنوسراوە، چاپخانەی ڕەنج ، سلێمانی، ٢٠٠٤.

ـ د. محەمەد بن سعود ئەلبەشر، سەرەتایەك لە پێوەندیکردنی سیاسی، و: مەم بورهان قانع، چاپی یەکەم ،چاپخانەی بینیای، ٢٠٠٧.

ـ محەمەد عەبدوڵا کەلاری، جیهانگیری میدیا، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی، دهۆك، ساڵی ٢٠٠٩.
ـ موسلح عەبدولقەهار ئیروانی، ئاین و ناسیۆنالیزم، ڕۆڵ و کاریگەری و پێوەندی نێوانیان لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ لە هەرێمی کوردستان، نامەی ماستەر پێشکەشی کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی سەلاحەدین کراوە، هەولێر، ٢٠٠٢.
ـ محەمەد فاتیح، ڕۆشنبیری و ڕۆشنبیری حزبایەتی، بەشی ڕوناکبیری (١٠٩) مەکتەبی ڕێکخستن، سلێمانی، ٢٠٠٥.
ـ د.هانی ئەلرەزا و د. ڕامز عەمار، ڕای گشتیی و ڕاگەیاندن و بانگەشەکردن و: ئەحمەد سەلام، چاپخانەی ئەلەند، چاپ و ساڵ نەنووسراوە.
ـ هەڤاڵ ئەبوبەکر، ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی کوردی، چاپی یەکەم، ناوەندی ڕۆشنبیریی، سلێمانی، ٢٠٠٢.
ـ هەندرێن، خامەیەکی ڕۆشنبیریی لە پشت گوێی زمان، چاپی یەکەم، وەزارەتی ڕۆشنبیریی ـ بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٧.

## گۆڤارەکان:

ــــ د.ئیــبراهیم ئیــبراش، ئاســت و شــێوەکانی بەشــداری سیاســی، و: حیکمــەت نامیق،گۆڤاری تۆژینەوە، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هــەولێر، ژمــارە (٢) ساڵی یەکەم، حوزەیرانی ٢٠٠٥.
ـ خالید عومــەر ڕەشــید، پێگــەی ڕاگەیانــدن لــە سیســتەمی سیاســییدا، گۆڤــاری ڕۆشــنگەری، ژمــارە (٢٣ ــــ ٢٤)، لــە بڵاوکروەکــانی نێوەنــدی ڕۆشــنگەری بــۆ لێکۆڵینەوەی فیکری و سیاسی ،ساڵ و شوێن نەنووسراوە.
ـ ڕێبین هەردی، ناسیۆنالیزم و وەرگێــڕان، گۆڤــاری ڕەهەنــد، گۆڤــارێکی مانگانــەی تیۆری کولتوورییە، چاپخانەی کاردۆ، سلێمانی، ژمارە (٢)، ساڵی ٢٠١٠.
ـ سەروەر محەمەد عەبدوڵڵا، کۆسپەکانی بنیاتنانی کولتووری بەشداریکردن، گۆڤاری هێشتا، هەڵەبجە، ژمارە ٦ و ٧، ٢٠٠٧.
ـ عابد خالیــد ڕەســوڵ، ڕۆڵــی حکوومــەت لــە بەشــداریکردنی سیاســیدا، گۆڤــاری ڕۆشنگەری، لە بڵاوکراوەکــانی نێوەنــدی ڕۆشــنگەری بــۆ لێکۆڵینــەوەی فیکــری و سیاسی، ژمارە (٢٥)، ساڵ و شوێن نەنوسراوە.
ـ عــادل باخــەوان، ڕۆشــنبیریی سیاســی و سیاســەتی ڕۆشــنبیر، گۆڤــاری ڕەهەنــد، گۆڤارێکی مانگانەی تیۆری کولتوورییە، چاپخانەی کاردۆ، ســلێمانی، ژمــارە (٢)، ساڵی ٢٠١٠.
ـ عەتا قەرەداخی، کورد و ڕۆشــنبیریی سیاســی، گۆڤــاری لڤــین، ســلێمانی، ســاڵی هەشتەم، ژمارە (١١٥)، ٢٠/١/٢٠١٠.
ـ عوسمان عەلی حەسەن، بەشداری سیاسی (لێکۆڵینەوەیــەکی سیاســی کۆمەڵایــەتی یاساییە) گۆڤاری یاسا و ڕامیاری، گۆڤــارێکی نیــو ســاڵانەیی زانســتییە، لەلایــەن کۆلێژی یاسا و ڕامیاری زانکۆی سەلاحەدین دەردەچێت، ساڵی شەشەم، ژمــارە (٤)، ٢٠٠٨.

ـ فازل عومەر ڕەشید، ڕۆڵی ڕۆشنبیر لە شەڕی ناوخۆدا، گۆڤاری خامـە، گۆڤـارێکی ئەکادیمی زانستی قوتابیانەی وەرزییە، سەنتەری خامە بۆ ڕاگەیاندن و لێکۆڵینـەوەی قوتابیان دەریدەکات، هەولێر، ژمارە (٢)، زستانی ٢٠٠٦.
ـ کنێر عەبدوڵا، بەشـداریکردن لـە نێـوان ڕۆشـنبیریی و پەروەردەکردنـدا، گۆڤـاری سەردەم، گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کولتووری بیانی، دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ساڵی دەیەم، ژمارە (٥٥)، هاوینی ٢٠٠٨.
ـ هاوژین مەلا ئەمین، ناسیۆنالیزم و ئـازادی و تاکەکـەس، گۆڤـاری ڕۆشـنگەری، لـە بڵاوکراوەکانی نیوەندی ڕۆشنگەری بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری و سیاسی، ژمارە (٢٦).

## فەرهەنگەکان:

ـ زاهیر محەمەدی و یاسین حاجی زادە ، فەرهەنگی سیاسی، چـاپخانەی ڕۆژهـەڵات، هەولێر، چاپ نەنوسراوە، ٢٠٠٦.
ـ مەسعود عەبدولخالق، مەوسوعەی جـودی، چـاپی یەکـەم، نووسـینگەی شـرۆڤە، هەولێر، ٢٠٠٨.

دەستوور:
ـ پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان — عێراق.

## سەرچاوە عەرەبییەکان:

ـ جابریل أیة ئةلمؤند وجی.بنجام باویل الابـن، السیاسـات المقارنـة في وقتنـا الحاضـر، ترجمة : هشام عبدالله، الطبعة الاولى، الدار الاهلية للنشر والطبع، عمان، ١٩٨٨.
ـ د. حسان محةمـةد شـفيق العـانى، الانظمـة السياسـية و الدسـتورية المقارنـة، بـدون مطبعة و طبعة، ٢٠٠٧.

ـ د. سهيل عروسي، المجتمع المدنى و الدولة، دار الفكر، طبعة الاولى، دمشق ـ سوريا، ٢٠٠٨.

ـ شوقى جلال، المجتمع المدنى و ثقافة الاصلاح، دار العين، القاهرة، الطبعة الاولى، ٢٠٠٥.

ـ د. عبدالله محةمةد الرحمن، علم الاجتماع السياسي، الطبعة الاولى، دار النهضة العربية، بيروت، ٢٠٠١.

ـ موريس دوفرجية، علم اجتماع السياسة، ترجمة : د. سليم حداد، المؤسسة الجامعية للدراسات و النشر والتوزيع، بيروت، طبعة الثانى، ٢٠٠١.

گۆڤار:

ـ د. عبدالله احمد الذيفاني، التربية والمجتمع والثقافة، مجلة دراسات اجتماعية، مجلة فصلية علمية يصدرها قسم الدراسات الاجتماعية، بيت الحكمة ـ بغداد، سنة الثانية، رِقم (٥)، ٢٠٠٠.

سەرچاوە ئەلیکترۆنییەکان:

ـ " الشبكة النبا المعلوماتية " (مفهوم الثقافة السياسية) ، منشور على الانترنيت في الموقع التالي: http://ar.wikipedia.org www.google.com

ـ د.السيد عليوة و د. منى محمود، المشاركة السياسيية، منشور على الانترنيت في الموقع التالي : http:// www.dctcrs.org

ـ پەرلەمانی کوردستانی ـ عێراق ، http:// www.perleman.org

# پاشکۆ

وەزارەتی خوێندنی باڵاوتۆژینەوەی زانستی

زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر ژمارەی فۆر ( )

کۆلێژی یاسا و ڕامیاری بەرواری / ۲/ ۲۰۱۰

بەشی ڕامیاری/بەیانیان

**فۆڕمی ڕاپرسی**

هاووڵاتی بەڕێز:

ئەم فۆڕمەی لەبەردەستتدایە ئامانجی زانینی بیروڕای تایبەتی تۆیە لەبارەی ئەو بابەتانەی کە لە خۆی گرتووە، گومان لەوەدا نییە کە وەڵامدانەوەت بەشێوەیەکی وورد و دڵنیاییەوە دەبێتە هۆی زیاتر و سودبەخشین بەلێکۆڵینەوەکەمان، بۆ زیاتر دڵنیابوونت ئەم زانیاریانە بۆ تۆژینەوەیەکە بەناونیشانی (ڕۆشنبیریی سیاسی و کاریگەری لەبەدیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگە، (هەرێمی کوردستان وەك نموونە) کە تەنیا بۆ کاری زانستی (تۆژینەوەی وەرگرتنی پلەی بەکالۆریۆس لە زانستی سیاسەت) بەکاردێت...

تێبینی:

١- نیشانەی (√) لە بەرامبەر ئەو بیرۆکەیە دابنێ کە بگونجاوی دەزانی.

٢- ڕای تایبەتی خۆت دەرببڕە لەبارەی پرسیاری (٦).

٣- هیچ بڕگەیەك بە بێ وەڵام بە جێ مەهێڵە. لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێز و سڵاومان بۆ تۆی بەڕێز....

زانیاریی گشتیی:

١. ڕەگەز : نێر ( ) مێ ( )

٢. تەمەن : ( )

٣. پیشە : ( )

٤. ئاستی خوێندنت : نەخوێندەوار ( ) سەرەتای ( ) ناوەندی ( ) ئامادەیی ( ) زانکۆ و پەیمانگە ( ) زانکۆ بەرەو سەر ( )

٥. باری کۆمەڵایەتی : خێزاندار ( ) سەڵت ( )

پرسیارەکان:

١- ئایا، هاوکاری و بەشداریت هەیە لەگەڵ ڕێکخراوەکان ؟

بەڵێ ( ) نەخێر ( )

٢- ئایا، وابەستەت هەیە بۆ حزبێك یاخوود لایەنێکی سیاسی ؟

بەڵێ ( ) نەخێر ( )

٣. بەڕای تۆ، ڕەوشی دیموکراتی کوردستان چۆن هەڵدەسەنگێنی ؟

ڕەوشێکی سەرکەوتووە ( ) ڕەوشێکی سەرنەکەوتوە ( )

بۆچی ..............................................................

٤. پێت وایە، ڕۆڵی ڕۆشنبیران لە گەشەدان بەرەوتی دیموکراتی لە کوردستان چۆنە؟

زۆر (   )    تاڕادەیەك (   )    کەم (   )    نازانم (   )

٥. ئایا، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی و پارتە سیاسییەکان و دەزگەکانی ڕاگەیاندن تا چەندە توانیویانە ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەی کوردیدا بلاوبکەنەوە؟

تاڕادەیەکی زۆر ( )  تاڕادەیەکی مامناوەند (   )    تاڕادەیەکی کەم ( )

٦ . بەڕای تۆ، چی بکرێت باشە بۆ ئەوەی ڕۆشنبیریی سیاسی لای تاکی کورد لە ئاستێکی بەرزدابێت ؟

١- ..............................................................

٢- ..............................................................

٣- ..............................................................

٧. بەڕای تۆ ، کام لەم کەناڵانە زیاتر توانیویانە ڕۆشنبیریی سیاسی لە ناو کۆمەڵگەی کوردیدا لای تاکی کورد بەرز بکاتەوە؟

١. پارتە سیاسییەکان (   )

٢. ڕیکخراوەکانی کۆمەڵگەی شارستانی (   )

٣. دەزگەکانی ڕاگەیاندن (   )

سوپاس بۆ هاوکاریت..

## لێتۆژ لە چەند دێڕێکدا



ϖ ناوی سیانی : سەروەر حەمە ئەحمەد

ϖ لە ساڵی ١٩٨٨ز لە گوندی (زەڕایەن)ی دەشتی شارەزوور لە دایك بووە.

ϖ قۆناخی سەرەتایی لە گوندەکەی خۆیان بە پێشەنگی سەر پۆلەکەی بڕیوە.

ϖ قۆناخەکانی ناوەندی و ئامادەیی لە قوتابخانەی دواناوەندی ئالانی کوڕان لە قەزای شارەزوور زۆر بە سەرکەوتوویی تەواو کردووە.

ϖ لەساڵی ٢٠٠٧ـ٢٠٠٦ لە کۆلێژی یاسا و ڕامیاری بەشی ڕامیاری زانکۆی سەلاحەدین وەرگیراوە.

ϖ لە ساڵی ٢٠١٠ـ٢٠٠٩ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە زانستە ڕامیارییەکان لە کۆلێژی یاسا و ڕامیاری زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر. بە پلەی یەکەم لەسەر ئاستی بەشەکەی بەدەستهێناوە.

ϖ ی. لێتۆژ لە کۆلێژی یاسا و ڕامیاری زانکۆی سەلاحەدین.

ϖ ی. لێکۆڵەری سیاسی لە کۆمەڵەی زانستە سیاسییەکانی کوردستان.

ϖ خاوەنی چەندین تۆژینەوەی زانستییە وەك (ناسیۆنالیزمی کوردی، ئۆپۆزسیۆن لە سیستەمی سیاسی دیموکراتیدا).

ϖ خاوەنی چەندین وتار و بابەتە لە ڕۆژنامە و گۆڤار و سایتە ئەلیکترۆنییەکان.